# الرَّدُّ عَلى الزَّنَادِقَةِ وَالجَهْمِيَّةِ

## فِيمَا شَكَّتْ مِنْ مُتَشَابِهِ القُرْآنِ
## وَتَأَوَّلَتْهُ عَلَى غَيْرِ تَأْوِيلِهِ


نووسینی:

الإمَام أَبِي عَبْدِاللهِ أَحْمَد بْن حَنْبَل الشَّيْبَانِي

٢٤١هـ

وەرگێڕانی:

"هلال عبدلله عمر"

# پێڕست

# کورتەیەک دەربارەی ئیمامی أحمد بن حنبل

# رحمه الله تعالى



ناوی أبو عبد الله أحمد بن محمد بن حنبل الشيباني الذهلي (**١٦٤ - ٢٤١** ﻫ)، لە بەغدا لەدایک بووە .

کونیەکەی : أبو عبدالله یە .

وە ئیمامی أحمد بە ئارامگریەکەی ناسراوە لەسەر ئەو تاقیکردنەوەی کە تووشی بوو بەناوی (فتنة خلق القرآن)، ئەو فیتنەیە کە ڕوویدا لەسەردەمی عەباسییەکان، لەسەردەمی خەلیفە المأمون، پاشان المعتصم و الواثق، ئەو خەلیفانە پێیان وابووە کە قورئان مەخلوقە و داهێنراوە کە ئەوەش بیر و بۆچوونی جەهمی و موعتەزیلەکانە، بەڵام ئیمامی أحمد وە غەیری ئەو لە زانایان پێچەوانەی ئەوەیان وت و لەسەر قسەی خۆی سوور بوو، بۆیە خرایە زیندانەوە و ئازارێکی زۆریاندا، پاشان لە زیندان دەرچوو و گەڕایەوە

بۆ سەر دەرس و حەدیسەکان، وە کاتێ المتوکل حوکمی گرتە دەست ئەم فیتنەیە بەتەواوی کۆتایی پێ هات .

# مامۆستاكانى



١ - أبو عبدالله محمد بن إدريس الشافعي .

٢ - أبو محمد المعتمر بن سليمان التيمي .

٣ - وه أبو محمد سفيان بن عيينة الهلالي .

٤ - إسحاق بن إبراهيم بن مخلد أبو يعقوب الحنظلي ناسراوه به ابن راهويه .

٥ - علي بن إبراهيم البناني المروزي .

٦ - عبد الرزاق بن همام الصنعاني .

٧ - أبو إسحاق إبراهيم بن سعد بن إبراهيم الزهري .

وه غەيرى ئەوانەش، رحمهم الله اجمعين .

# قوتابیەکانی



١ - أبو بكر المروذي .

٢ - حرب بن إسماعيل الكرماني .

٣ - أبو داوود السجستاني .

٤ - محمد بن إسماعيل البخاري .

٥ - مسلم بن الحجاج النيسابوري .

٦ - إبراهيم بن إسحاق الحربي .

٧ - صالح و عبدالله كوڕەكانى ئیمامی أحمد .

٨ - إسحاقی مامی ئیمامی أحمد .

٩ - حنبل بن إسحاق كە ئامۆزایەتی .

١٠ - عبدالملك بن عبدالحميد الميموني .

١١ - أبو بكر الأثرم .

**١٢** - أبو حاتم وأبو زرعة الرازييان .

وە غەیری ئەوانەش، رحمهم الله أجمعين .

# مەدحكردنی ئیمامی أحمد رحمه الله لەلایەن زانایانەوە



١ - إبراهيم الحربي دەڵێت : أبا عبدالله م بینی وەک ئەوەی الله هەموو علمەکانی یەکەمەکان و کۆتاییەکانی لەودا کۆکردبێتەوە لە هەموو بەشەکان .

سير أعلام النبلاء : ١١ / ١٨٨

٢ - ئیمامی الشافعي دەڵێت : أحمد ئیمامە لە هەشت تایبەتمەندیدا : ئیمامە لە فەرموودە، وە ئیمامە لە فیقهـ، وە ئیمامە لە زمان - اللغة -، وە ئیمامە لە قورئان، وە ئیمامە لە هەژاری، وە ئیمامە لە زوهد و دونیا نەویستی، وە ئیمامە لە وەرەع، وە ئیمامە لە سوننەت .

طبقات الحنابلة : ١ / ٥

٣ - أبو زرعة بە عبدالله بن احمد بن حنبل ی وت : باوکت هەزار هەزار حەدیسی لەبەر دەکرد .

سير أعلام النبلاء : ١١ / ١٨٨ - تاريخ بغداد : ٤ /٤١٩

٤ - الميموني وتى : گوێم لە علي بن المديني بوو دەيوت : هيچ كەسێك هەڵنەستاوە بۆ بەڕێوبردنى ئيسلام لە دواى رسول الله ﷺ وەك لەوەى أحمد بن حنبل پێى هەڵسا .

وتى : پێم وت : ئەى باوكى الحسن وە نە أبو بكر يش؟

وتى : - بەڵێ - ، وە نە أبو بكر يش، چونكە أبو بكر يارمەتيدەر و هاوەڵانى هەبوو، بەڵام أحمد بن حنبل نە يارمەتيدەر و نە هاوەڵانيش هەبوو .

**تاريخ بغداد : ٤ - ٤١٧ / ٤١٨**

٥ - أبو عبيد القاسم بن سلام وتى : عيلم كۆتايى هات لەلاى چوار كەس : أحمد بن حنبل، وە علي بن المديني، وە يحيى بن معين، وە أبي بكر بن أبي شيبة، أحمد لەهەموويان فەقهيتر بوو .

**مناقب الإمام أحمد : ١٥٥**

٦ - عزرة بن عبدالله و طالوت بن لقمان بۆى باسكردين، وتيان : بيستم زكريا بن يحيى دەيوت : لە خەونمدا احمد بن حنبل م بينى و تاجێكى ڕازێنراو بە گەوهەرى لەسەردا بوو، وە دوو نەعلى لە پێدا بوو بە لە خۆبايى بوونەوە پێيەوە دەڕۆيشت .

پاشان وتم : ئەى باوكى عبدالله، الله چى لێكردى؟

وتى : لێم خۆشبوو، وه له خۆى نزيكى كردمه‌وه، وه به ده‌ستى خۆى ئه‌م تاجه‌ى له‌سه‌ر كردم، وه پێى فه‌رمووم : ئه‌مه به هۆى ئه‌و قسه‌يه‌ته‌وه كه وتت : قورئان كه‌لامى الله يه و مه‌خلوق نييه .

وتى : وتم : ئه‌ى ئه‌م له‌خۆبايي بوونه چيه كه نه‌مزانيوه تۆ هه‌تبوبێت له ژيانى دونيادا؟

وتى : ئه‌مه ڕۆيشتنى خزمه‌تكاره‌كانه له ماڵى السلام - واته له به‌هه‌شت، والله اعلم - .

**الرد على المبتدعة : ٣٠٠**

٧ - قتيبة بن سعيد وتى : ئه‌گه‌ر پياوێكت بينى ئيمامى أحمد ى خۆشده‌ويست ئه‌وا له‌سه‌ر سوننه‌ته، وه هه‌ركه‌سێك پێچه‌وانه‌ى ئه‌وه بكات بزانه كه مبتدعه - گومڕاييه - .

**رواه أبي حاتم في (الجرح والتعديل : ٣٠٨ / ١)**

أبو بكر الخلال رحمه الله وتى :

هەواڵی پێداین الخضر بن المثنى الكندي، وتى : عبدالله بن أحمد بن حنبل رحمه الله، وتى : ئەوەی كە باوكم رحمه الله دەریهێناوە لە (الرد على الزنادقة والجهمية فيما شكَّت فيه من متشابه القرآن و تأوَّلته على غير تأويله) .

احمد بن محمد بن حنبل الشيباني رحمه الله پاداشتی بەهەشتی پێ بدرێت، وە الله لە ئەو و لە ئێمەش خۆشبێت بە منەت و كەرەمی خۆی آمين،

وتى : سوپاس بۆ الله كە لە هەموو سەردەمێكدا كە پێغەمبەری نەناردووە كەسانێكی هێشتۆتەوە لە ئەهلی عیلم، بانگەوازی ئەو كەسانە دەكەن كە گومڕابوون بۆ هیدایەت، وە ئارام دەگرن لەسەر ئەو ئازارانەی كە پێیان دەدرێ - لێرەدا ئیمامی احمد لە زیندان بووە و كتێبیشی نوسیوە - ، مردووەكان بە كتێبی الله زیندوو دەكەنەوە [واتە دڵیان], وە بە نووری الله ئەوانەی كوێرن بەصیرەتیان پێ دەبەخشن، جا چەند كوژراوی دەستی ئیبلیس هەن كە ئەوان زیندوویان كردوونەتەوە، وە چەند گومڕای ڕێگا ونكەر هەن كە ئەوان ڕێنمونیان كردوون، بۆیە چەند جوانە جێ دەست و شوێنەواریان لەسەر خەڵكی، بەڵام چەند ناشرینە جێ دەست و شوێنەواری خەڵكی لەسەر ئەوان .

ڕێگری دەکەن لە تەحریف کردنی کتێبی الله لە لایەن زیادەڕۆکانەوە، وە لە بانگەشەی پوچەڵکارەکان، وە لە تەئویل کردنی جاهیلەکان، لەوانەی کە هەڵگری ئاڵای بیدعەن، وە ڕێگای فیتنەیان واڵا کرد، ئەوان خیلافیان هەیە دەربارەی قورئان، موخالفی قورئانن، کۆکن لەسەر موخالەفە کردنی قورئان، قسە دەکەن بە درۆ بەناوی الله و دەربارەی الله و دەربارەی کتێبی الله بەبێ عیلم .

قسە دەکەن بە وتەی ناڕوون، وە خەڵکانی نەزان دەخەڵەتێنن بەو شوبهانەی کە بۆیان دروست دەکەن، بۆیە پەنا دەگرین بە الله لە فیتنەی گومڕاکەران .

# باب (١)

## بيان ما ضلَّت فيه الزنادقة من مُتشابه القرآن



١ - قال أحمد (رحمه الله) في قوله عَزَّ وَجَلَّ :

﴿كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا﴾ [النساء : ٥٦] .

قالت الزنادقة : فما بال جلودهم التي عصت قد احترقت، وأبدلهم الله جلودًا غيرها؟ فلا نرى إلَّا أن الله يُعذِّب جلوداً لم تُذنب حين يقول : ﴿بَدَّلْنَٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا﴾، فشكُّوا في القرآن، وزعموا أنه مُتناقض.

فقلت لهم : إن قول الله عَزَّ وَجَلَّ : ﴿بَدَّلْنَٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا﴾ [النساء : ٥٦]

ليس معناه : جلودًا غير جلودهم، وإنما معنى : ﴿بَدَّلْنَٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا﴾ تبديلها: تجديدها؛ لأن جلودهم إذا نضجت، جدَّدها الله، وذلك لأن القرآن فيه خاصٌّ وعامٌّ، ووجوه كثيرة، وخواطر يعلمها العلماء .

# باب (١)

## ڕوونکردنەوەی ئەو ئایەتە موتەشابیهانەی کە زەندیقەکان گومڕابوون تیایدا



١ - ئیمامی أحمد رحمه الله لەبارەی فەرمایشتی الله تعالی : ﴿كُلَّمَا نَضِجَتۡ جُلُودُهُم بَدَّلۡنَٰهُمۡ جُلُودًا غَيۡرَهَا﴾ [النساء: ٥٦]

وتی : زەندیقەکان وتیان : ئایا ئەو پێستانەیان چی لێدێت کە تاوانیان کردووە و سووتاون، لە کاتێکدا الله ئەو پێستانەیان بە پێستی دیکە دەگۆڕێتەوە؟

ئێمە وای نابینین ئیللا بەوە نەبێت کە الله سزای چەند پێستێک دەدات کە تاوانی نەکردووە کاتێک دەفەرمووێت : ﴿بَدَّلۡنَٰهُمۡ جُلُودًا غَيۡرَهَا﴾ .

جا گومانیان لە قورئان کرد، وە پێیان وابوو کە یەکتر بەتاڵ دەکاتەوە .

- ئیمامی احمد رحمه الله دەڵێت - ، بۆیە پێیانم وت : بێگومان فەرمایشتی الله عزَّوَجَل : ﴿بَدَّلْنَٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا﴾ ئەو مانایەی نییە - کە زەندیقەکان دەیکەن - دەڵێن : پێستێک لەغەیری پێستی خۆیان .

بەڵکو مانای : ﴿بَدَّلْنَٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا﴾ گۆڕینیان واتە : نوێکردنەوەیان، چونکە پێستەکانیان کاتێ دەسوتێت، الله نوێی دەکاتەوە، وە ئەمە لەبەر ئەوەیە کە قورئان گشتی و تایبەتی تێدایە، وە ڕووەکانی زۆرن، وە یادخستەوەی تیایە کە زانایان دەیزانن .

---

: هەڵەی زەندیقەکان لێرەدا لەو ئایەتە بوو ﴿بَدَّلْنَٰهُمْ﴾،

واتە پێیان وابوو کە ئەم وشەیە بەمانای گۆڕینی پێستی کەسێک بۆ کەسێکی تر دێت،

وە پێیان وایە کە الله کەسێ تاوانی نەکردبێ سزای دەدات، وە بۆیەش دەڵێت ئەو ئایەتە پێچەوانەی ئایەتی ترە، چونکە الله تعالى فەرموویەتی : ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾ [فاطر - ١٨]

بەڵام ئیمامی احمد ئەم وشەیە ﴿بَدَّلْنَٰهُمْ﴾ ڕوون دەکاتەوە، کە بەمانای نوێکردنەوە دێت، نەک گۆڕین، والله اعلم .



٢ - وأما قوله الله عَزَّ وَجَلَّ : ﴿هَٰذَا يَوۡمُ لَا يَنطِقُونَ * وَلَا يُؤۡذَنُ لَهُمۡ فَيَعۡتَذِرُونَ﴾ [المرسلات: ٣٥، ٣٦] .

ثم قال في آيةٍ أُخرى :

﴿ثُمَّ إِنَّكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمۡ تَخۡتَصِمُونَ﴾ [الزمر: ٣١] .

فقالوا : كيف يكون هذا من الكلام المُحكم؟!

قال : ﴿هَٰذَا يَوۡمُ لَا يَنطِقُونَ﴾، ثم قال في موضعٍ آخر : ﴿ثُمَّ إِنَّكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمۡ تَخۡتَصِمُونَ﴾ [الزمر: ٣١] .

فزعموا أن هذا الكلام ينقضُ بعضه بعضًا، فشكُّوا في القرآن .

أما تفسير : ﴿هَٰذَا يَوۡمُ لَا يَنطِقُونَ﴾ الآية: فهذا أول ما تبعث الخلائق على مقدار ستين سنة لا ينطقون، ولا يؤذن لهم في الاعتذار فيعتذرون، ثم يؤذن لهم في كلام فيتكلمون، فذلك قوله: ﴿رَبَّنَآ أَبۡصَرۡنَا وَسَمِعۡنَا فَٱرۡجِعۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا﴾ الآية [السجدة: ١٢] .

فإذا أَذِنَ لهم في الكلام فتكلموا واختصموا فذلك قوله : ﴿ثُمَّ إِنَّكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمۡ تَخۡتَصِمُونَ﴾، عند الحساب وإعطاء المظالم.

ثم يُقال لهم بعد ذلك : ﴿لَا تَخۡتَصِمُواْ لَدَيَّ﴾ أي: عندي، ﴿وَقَدۡ قَدَّمۡتُ إِلَيۡكُم بِٱلۡوَعِيدِ﴾ [ق: ٢٨] يعني: في الدنيا، فإن العذاب مع هذا القول كائن .

٢ - هەروەها لە فەرمایشتی الله عز و جل : ﴿هَٰذَا يَوۡمُ لَا يَنطِقُونَ * وَلَا يُؤۡذَنُ لَهُمۡ فَيَعۡتَذِرُونَ﴾ [المرسلات : ٣٥ - ٣٦] .

پاشان لە ئایەتێکی تر فەرمووی : ﴿ثُمَّ إِنَّكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمۡ تَخۡتَصِمُونَ﴾ [الزمر - ٣١] .

- زەندیقەکان - وتیان : چۆن دەکرێ ئەم ئایەتانە لە کەلامی موحکەم بن؟! - واتە لای ئەوان دوو ئایەتەکە کە پێچەوانەی یەکترن کەواتە چۆن دەبنە موحکەم - .

الله فەرموویەتی : ﴿هَٰذَا يَوۡمُ لَا يَنطِقُونَ﴾، پاشان لە شوێنێکی تر فەرموویەتی : ﴿ثُمَّ إِنَّكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمۡ تَخۡتَصِمُونَ﴾ [الزمر - ٣١] .

پێیان وابوو کە ئەم کەلامە یەکتر هەڵدەوەشێنێتەوە، بۆیە گومانیان لە قورئان کرد .

---

واتە زەندیقەکان دەڵێن : الله باس لەوە دەکات کە کافرەکان قسە ناکەن لەم ئایەتە : ﴿هَٰذَا يَوۡمُ لَا يَنطِقُونَ﴾، پاشان لە شوێنێکی تر باس لەوە دەکات کە موجادەلە دەکەن لای الله لەم ئایەتە : ﴿ثُمَّ إِنَّكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمۡ تَخۡتَصِمُونَ﴾ .

دەڵێن : ئەم دوو ئایەتە هەڵوەشێنەرەوەی یەکترن .

بەڵام ئیمامی أحمد ڕەددیان دەداتەوە و دەڵێت :

ئەمما تەفسیری : ﴿هَٰذَا يَوۡمُ لَا يَنطِقُونَ﴾، ئا ئەوە یەکەمجارە کە درووستکراوەکان زیندوو دەکرێنەوە بە ئەندازی شەست ساڵ قسە ناکەن، وە ڕێگەیان پێ نادرێت هیچ عوزر و بیانوویەک بێننەوە، پاشان ڕێگەیان پێ دەدرێت کە قسەکەن ئەوانیش قسە دەکەن، ئەمەش لەم فەرمایشتەیە کە : ﴿رَبَّنَآ أَبۡصَرۡنَا وَسَمِعۡنَا فَٱرۡجِعۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا﴾ [السجدة - ١٢]

.

ئینجا کاتێک ڕێگەیان بە قسەکردن پێدرا قسە دەکەن و جیدال دەکەن، ئەوە ئەم فەرمایشتەیە : ﴿ثُمَّ إِنَّكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمۡ تَخۡتَصِمُونَ﴾، لە کاتی لێپێچینەوە و پێدانی مافی ستەم لێکراوان .

لەدوای ئەمە الله پێیان دەفەرمووێت : ﴿لَا تَخۡتَصِمُواْ لَدَيَّ﴾، واتە : لای من - جیدال و مناقشە مەکەن - .

﴿وَقَدۡ قَدَّمۡتُ إِلَيۡكُم بِٱلۡوَعِيدِ﴾، واتە : لە دونیادا - واتە الله پێیان دەفەرموێ : پێشوو لەدونیادا هەڕەشەم لێکردبوون و ئاگاداری ئەو ڕۆژەم کردبوونەوە - ، ئینجا سزا و ئەم وتەیە هەر ڕوودەدەن .



٣ - وأما قوله عَزَّ وَجَل: ﴿وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ الْقِيامَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا﴾ [الإسراء: ٩٧].

وقال في آيةٍ أُخرى: ﴿وَنَادَىٰ أَصْحَابُ النَّارِ أَصْحَابَ الْجَنَّةِ﴾ [الأعراف: ٥٠]، ﴿وَنَادَىٰ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ أَصْحَٰبَ ٱلنَّارِ﴾ [الأعراف: ٤٤].

فقالوا: كيف يكون هذا من الكلام المحكم؟

قال: ﴿وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ الْقِيامَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا﴾.

ثم يقول في موضعٍ آخر: إنه ينادي بعضهم بعضًا.

فشكُّوا في القرآن من أجل ذلك.

أما تفسير: ﴿وَنَادَىٰ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ أَصْحَابَ النَّارِ﴾، ﴿وَنَادَى أَصْحَابُ النَّارِ أَصْحَابَ الْجَنَّةِ﴾:

فإنهم أول ما يدخلون النار يُكّلم بعضهم بعضًا، وينادون: ﴿يَٰمَٰلِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ﴾ [الزخرف: ٧٧].

ويقولون: ﴿رَبَّنَا أَخِّرْنَا إِلَىٰ أَجَلٍ قَرِيبٍ﴾ [إبراهيم: ٤٤].

و ﴿رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا﴾ [المؤمنون: ١٠٦].

فهم يتكلمون حتى قال لهم: ﴿اخْسَئُوا فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ﴾ [المؤمنون: ١٠٨].

فصاروا عُميًا وبُكمًا وصُمًّا، وينقطع الكلام ويبقى الزفير والشهيق.

فهذا تفسير ما شكَّت فيه الزنادقة من قول الله عَزَّ وَجَلَّ .

٣ - وه هەروەها قەولی الله عزَّوَجَل : ﴿وَنَحۡشُرُهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ عُمۡيٗا وَبُكۡمٗا وَصُمّٗاۖ﴾، [الإسراء - ٩٧] .

وه لە ئایەتێکی تر دەفەرمووێت : ﴿وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ﴾، [الأعراف - ٥٠] .

﴿وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ﴾، [الأعراف - ٤٤] .

- زەندیقەکان - وتیان : چۆن دەکرێ ئەم ئایەتانە لە کەلامی موحکەم بن ؟!

الله فەرموویەتی : ﴿وَنَحۡشُرُهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ عُمۡيٗا وَبُكۡمٗا وَصُمّٗاۖ﴾ .

واتە : الله تعالی لەڕۆژی قیامەت لەسەر ڕووخساریان حەشریان دەکات کە کوێر و لاڵ و کەڕن .

پاشان لە شوێنێکی تر دەفەرمووێت : هەندێکیان بانگی ئەوانی تر دەکەن .

جا لەبەر ئەمە گومانیان لە قورئان کرد .

- ئیمام أحمد لە ڕەددی ئەوان دەڵێت - ئەمما تەفسیری : ﴿وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ﴾، ﴿وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ﴾ :

ئەوانە کە یەکەمجار دەخرێنە ئاگرەوە هەندێکیان لەگەڵ ئەویتریان قسە دەکەن، وە بانگ دەکەن - واتە دۆزەخیەکان - : ﴿يَٰمَٰلِكُ لِيَقۡضِ عَلَيۡنَا رَبُّكَۖ قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ﴾، [الزخرف - ٧٧] .

وە دەڵێن : ﴿رَبَّنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٖ قَرِيبٖ﴾، [إبراهيم - ٤٤] .

وە ﴿رَبَّنَا غَلَبَتۡ عَلَيۡنَا شِقۡوَتُنَا﴾، [المؤمنون - ١٠٦] .

جا - دۆزەخیەکان - هەر قسە دەکەن تاکو پێیان دەوترێت : ﴿ٱخۡسَـُٔواْ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ﴾، [المؤمنون - ١٠٨] .

ئیتر کەڕ و لاڵ و کوێر دەبن، وە قسەکردن دەپچڕێت و تەنها دەنگی قیژە و هاوار و هەنسك دان دەمێنێتەوە .

جا ئا ئەمە تەفسیری ئەوەیە کە زەندیقەکان گومانیان تێیدا بۆ دروست بوو لە فەرمایشتی الله عزَّوَجَل .

---

: واتە زەندیقەکان وتیان : الله لە ئایەتێك باس لەوە دەکات کە لەسەر ڕووخساریان حەشر دەکرێن و کەڕو لاڵ و کوێرن، کەچی لەئایەتێکی تردا باس لەوە دەکات کە هاوڵانی دۆزەخ بانگی هاوەڵانی بەهەشت دەکەن .

ئەڵێن : لە ئایەتێک ئەفەرمووێت : کەڕ و لاڵ و کوێرن، لە ئایەتێکی تر دەفەرمووێت : بانگی یەکتر دەکەن .

پێیان وایە ئەم دوو ئایەتە موحکەم نییە وە زانراویش نییە، وە هەڵوەشێنەرەوەی یەکترن .

بەڵام ئیمامی أحمد ڕەددیان ئەداتەوە کە چ کاتێ بانگی یەکتر دەکەن، وە چ کاتێ کەڕ و لاڵ و کوێر دەبن، والله اعلم .



٤ - وأما قوله الله عَزَّ وَجَلَّ : ﴿فَلَآ أَنسَابَ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ﴾ [المؤمنون : ١٠١] .

وقال في آيةٍ أُخرى : ﴿فَأَقۡبَلَ بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ يَتَسَآءَلُونَ﴾ [الصافات : ٥٠] .

فقالوا : كيف يكون هذا من الكلام المحكم؟

فشكُّوا في القرآن من أجل ذلك.

أما قوله عَزَّ وَجَلَّ : ﴿فَلَآ أَنسَابَ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ﴾

فهذا عند النفخة الثانية، إذا قاموا من القبور، لا يتساءلون ولا ينطقون في ذلك الموطن.

فإذا حُوسبوا، ودخلوا الجنة والنار؛ أقبل بعضهم على بعضٍ يتساءلون، فهذا تفسير ما شكَّت فيه الزنادقة.

٤ - وه هه‌روه‌ها قه‌ولی الله تعالى : ﴿فَلَآ أَنسَابَ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ﴾، [المؤمنون - ١٠١] .

وه له ئایه‌تێکی تردا ده‌فه‌رمووێت : ﴿فَأَقۡبَلَ بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ يَتَسَآءَلُونَ﴾، [الصافات - ٥٠] .

وتیان : چۆن ده‌کرێ ئه‌م ئایه‌تانه له که‌لامی موحکه‌م بن؟!

جا لەبەر ئەمە گومانیان لە قورئان کرد .

- ئیمام أحمد لە ڕەددی ئەوان دەڵێت - ئەمما قەولی اللە عزَّوَجَل : ﴿فَلَآ أَنسَابَ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ﴾ .

ئەو ئایەتە لە کاتی نەفخی دووەمە، کاتێ هەڵستان لە گۆڕەکانیان، هیچ پرسیارێک ناکەن وە لەو شوێنەدا هیچ قسەیەکیش ناکەن .

پاشان کە لێپێچینەوەیان لەگەڵ کرا و خرانە بەهەشت و دۆزەخەوە، هەندێکیان ڕوو لە ئەوانی تر دەکەن و پرسیار دەکەن، ئا ئەمەش تەفسیری ئەوەیە کە زەندیقەکان گومانیان تێیدا بۆ دروست بوو .



٥ - وأما قوله الله عَزَّ وَجَلَّ : ﴿مَا سَلَكَكُمْ فِى سَقَرَ * قَالُواْ لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ﴾ [المدثر: ٤٢،٤٣] .

وقال في آيةٍ أُخرى : ﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ﴾ [الماعون : ٤] .

فقالوا : إن الله قد ذمَّ قومًا كانوا يصلون، قال : ﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ﴾.

وقد قال في قومٍ : إنهم إنما دخلوا النار لأنهم لم يكونوا يصلون! فشكُّوا في القرآن من أجل ذلك، وزعموا أنه مُتناقض.

قال : أما قوله : ﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ﴾ عنى بها المنافقين : ﴿ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ﴾، حتى يذهب الوقت، ﴿ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ﴾، يقول : إذا رأوهم صلوا، وإذا لم يروهم لم يصلوا.

وأما قوله : ﴿مَا سَلَكَكُمْ فِى سَقَرَ * قَالُواْ لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ﴾ [المدثر: ٤٢، ٤٣] .

يعني : الموحدين المؤمنين، فهذا ما شكَّت فيه الزنادقة.

٥ - وه فەرمايشتى الله عزَّوَجَل : ﴿مَا سَلَكَكُمْ فِى سَقَرَ * قَالُواْ لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ﴾، [المدثر ٤٢ - ٤٣] .

وه لە ئايەتێكی تردا دەفەرمووێت : ﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ﴾ [الماعون - ٤] .

وتيان : الله زەمی ئەو كۆمەڵانەی كرد كە نوێژ دەكەن، فەرموویەتی : ﴿فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ﴾ .

وە دەربارەی كۆمەڵانێك فەرموویەتی : ئەوانە خرانە ئاگرەوە چونكە نوێژیان نەدەكرد .

جا گومانیان لە قورئان كرد لەبەر ئەمە، وە پێیان وابوو هەڵوەشێنەرەوەی یەكترە .

- ئیمام أحمد ڕەددیان ئەداتەوە - ئەڵێت : ئەمما ئەمما قەولی الله عز و جل : ﴿فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ﴾، مەبەست پێی دووڕووەكانە، ئەوانەی كە : ﴿ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ﴾ [الماعون - ٥]، تاوەكو كاتەكەی دەڕوات و نامێنێت، ﴿ٱلَّذِينَ هُمۡ يُرَآءُونَ﴾، [الماعون - ٦]، دەڵێت : ئەگەر ببینرێن نوێژ دەكەن، وە گەر نەیانبینن نوێژ ناكەن - واتە نوێژكردنەكەیان بۆ الله نییە بەڵكو بۆ ئەوەیە كە خەڵك بیانبینن نوێژ دەكەن، پەنا بە الله - .

بەڵام قەولی الله تعالى : ﴿مَا سَلَكَكُمۡ فِي سَقَرَ * قَالُواْ لَمۡ نَكُ مِنَ ٱلۡمُصَلِّينَ﴾، [المدثر ٤٢ - ٤٣] .

واتە : موەحیدە ئیمانداره‌كان، ئەمە ئەو گومانەیە كە زەندیقەكان تێیدان .

: لێرەدا زەندیقەکان گومانیان لەوە بووە کە دەڵێن : الله لە ئایەتێ باس لەوە دەکات کە ئەوانەی نوێژ ناکەن دەخرێنە سقر کە شوێنێکی دۆزەخە .

وە لە ئایەتێکی تر وەیلی بۆ نوێژخوێنان داناوە ﴿فَوَيۡلٌ لِّلۡمُصَلِّينَ﴾ .

بەڵام ئیمام أحمد ڕەددیان ئەداتەوە کە ئەو وەیلە بۆ دووڕووەکانە .

وە ئەڵێت کە ﴿مَا سَلَكَكُمۡ فِي سَقَرَ * قَالُواْ لَمۡ نَكُ مِنَ ٱلۡمُصَلِّينَ﴾، مەبەستی ئەوەیە کە ئەوانەی ئەخرێنە سقرەوە لەبەرئەوەی کە موەحیدی ئیماندار نەبوون .

وە زەندیقەکان کە نوێژ ناکەن ئەو ئایەتە دەکەنە بەڵگە : ﴿فَوَيۡلٌ لِّلۡمُصَلِّينَ﴾، پێیان وایە وەیلی بۆ دانراوە و نابێت نوێژ بکەیت، بەڵام ئایەتەکەی دوای خۆی ناخوێننەوە کە ئەفەرمووێت : ﴿ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ﴾ .

الله پەنامان بدات لەگومڕایی ئەو گرووپانە .



٦ - وأما قوله عَزَّ وَجَلَّ : ﴿خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ﴾ [الروم : ٢٠] .

ثم قال : ﴿مِّن طِينٍ لَّازِبٍ﴾ [الصافات : ١١] .

ثم قال : ﴿مِن سُلَٰلَةٍ﴾ [المؤمنون : ١٢] .

ثم قال : ﴿مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ﴾ [الحجر : ٢٦] .

ثم قال : ﴿مِن صَلْصَٰلٍ كَٱلْفَخَّارِ﴾ [الرحمن: ١٤].

فشكُّوا في القرآن، وقالوا: هذا لا شكَّ أنه ينقض بعضه بعضًا.

هذا بدءُ خلق آدم، خلقه الله أول بدئه من ترابٍ، ثم من طينة حمراء وسوداء وبيضاء، ومن طينة طيبة وسبخة، فلذلك ذريته طيبٌ وخبيث، أسود وأحمر وأبيض.

ثم بلَّ ذلك التراب فصار طينًا، فذلك قوله : ﴿مِّن طِينٍ﴾ فلما لصق الطين بعضه ببعضٍ، فصار طينًا لازبًا، بمعنى لاصقًا.

ثم قال : ﴿مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ﴾ [المؤمنون : ١٢] .

يقول : مثل الطين إذا عصر انسلَّ من بين الأصابع، ثم نتن فصار حمأً مسنونًا، فخلق من الحمأ، فلما جفَّ صار صلصالاً كالفخار، يقول: صار له صلصلة كصلصلة الفخار، يقول: له دويٌّ كدوي الفخار.

فهذا بيان خلق آدم.

وأما قوله : ﴿مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ﴾ [السجدة : ٨].

فهذا بِدءُ خلق ذريته، من (سُلالة) يعني : النطفة إذا انسلت من الرجل، فذلك قوله : ﴿مِّن مَّآءٍ﴾؛ يعني : النطفة، ﴿مَّهِينٍ﴾ يعني : ضعيف.

فهذا ما شَكَّت فيه الزنادقة .

٦ - وه هەروەها فەرمایشتی الله عز و جل : ﴿خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ﴾ [الروم - ٢٠]

.

پاشان فەرمووی : ﴿مِّن طِينٍ لَّازِبٍ﴾، [الصافات - ١١] .

پاشان فەرمووی : ﴿مِن سُلَٰلَةٍ﴾، [المؤمنون - ١٢] .

پاشان فەرمووی : ﴿مِّنۡ حَمَإٍ مَّسۡنُونٍ﴾، [الحجر - ٢٦] .

پاشان فەرمووی : ﴿مِن صَلۡصَٰلٍ كَٱلۡفَخَّارِ﴾، [الرحمن - ١٤] .

بۆیە گومانیان لە قورئان کرد، وە وتیان : ئەوە هیچ گومانی تێدا نییە کە هەندێکی هەڵوەشێنەرەوەی هەندێکی دیکەیەتی .

- ئیمام أحمد ڕەددیان ئەداتەوە دەڵێت :- ئەوە سەرەتای درووست بوونی ئادەمە، الله لە سەرەتادا لە خۆڵ دروستی کرد، پاشان لە قوڕێکی سوور و ڕەش و سپی، وە لە قوڕێکی پاک و قوڕێک کە بۆ کشتوکاڵ بەکارنایەت - کە

له نێوان دەریاچەیەك و بیابانێكدا بوونی هەیە - ، بەهۆی ئەمەوە نەوەی پاك و پیس، ڕەش، سوور، سپی، لێ درووست دەبێت .

پاشان ئەو خۆڵەی تەڕ كرد و بوو بە قوڕ، ئەوە ئەو فەرمایشتەیە : ﴿مِّن طِينٍ﴾، كە قوڕەكە هەندێكی بە هەندێكی تری لكاو بوو بە قوڕێكی لینج، بەو مانایایە : پێوە لكاو .

پاشان فەرمووی : ﴿مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ﴾، [المؤمنون - ١٢] .

دەفەرموێت : وەكو قوڕ ئەگەر پەستانی بخرێتە سەر لە نێوان پەنجەكانەوە دەردەچێ، پاشان بۆگەن دەبێت و دەبێتە قوڕێكی ڕەشی گۆڕاو - واتە یەكەمجار قوڕە، كە دواتر ڕەنگ و بۆنی دەگۆڕێت پێی دەوترێ (حمأ مسنوناً) - ، كە وشك بۆوە دەبێتە قوڕێكی لووس وەكو ئەو قوڕانەی كە گۆزەیان لێ درووست دەكرێ .

دەفەرموێت : دەبێتە قوڕێكی لووس وەكو ئەو قوڕە لووسە كە گۆزەی لێ درووست دەكرێت، دەڵێت : دەنگێكی هەیە وەكی گۆزە .

جا ئەمە دەرخستن و ڕوونكردنەوەی درووست بوونی ئادەمە .

بەڵام فەرمایشتی الله عزَّوَجَل : ﴿مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ﴾، [السجدة - ٨] .

ئەوە سەرەتای درووست بوونی نەوەکانیەتی، لە (السلالة) واتە : دڵۆپە ئاو کاتێ لەپیاو دەردەچێ، ئەمە ئەو قەولەیە : ﴿مِّن مَّآءٍ﴾، واتە : دڵۆپە ئاو، ﴿مَّهِينٍ﴾ واتە : لاواز .

جا ئەمە بریتی بوو لەوەی کە زەندیقەکان تێیدا گومانیان هەبوو .

---

: زەندیقەکان پێیان وایە کە ئەو ئایەتانە بۆیە پێچەوانەی یەکترن چونکە لەهەرکامێکیان الله باس لەشتێک دەکات کە ئادەمی لێ درووست بووە، بەڵام لە فەرمووده هاتووە کە انسان قۆناغ بە قۆناغ درووست بووە، وە ئیمام أحمد یش رحمه الله بەڕوونی قۆناغەکانی باسکرد .



٧ - وأما قوله: ﴿رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ﴾ [الشعراء: ٢٨].

﴿رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ﴾ [الرحمن: ١٧].

﴿بِرَبِّ ٱلْمَشَٰرِقِ وَٱلْمَغَٰرِبِ إِنَّا لَقَٰدِرُونَ﴾ [المعارج: ٤٠].

فشكُّوا في القرآن، وقالوا: كيف يكون هذا من الكلام المحكم؟

أما قوله: ﴿رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ﴾ فهذا اليوم الذي يستوي فيه الليل والنهار، أقسم الله بمشرقه ومغربه.

وأما قوله: ﴿رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ (١٧)﴾، فهذا أطول يوم في السَّنة، وأقصر يوم في السَّنة، أقسم الله بمشرقهما ومغربهما.

وأما قوله: ﴿بِرَبِّ ٱلْمَشَٰرِقِ وَٱلْمَغَٰرِبِ إِنَّا لَقَٰدِرُونَ (٤٠)﴾، فهو مشارق السَّنة ومغاربها.

فهذا ما شكَّت فيه الزنادقة.

٧ - ئەمما فەرمايشتى اللە تعالى: ﴿رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ﴾، [الشعراء - ٢٨].

﴿رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ﴾، [الرحمن - ١٧].

﴿بِرَبِّ ٱلْمَشَٰرِقِ وَٱلْمَغَٰرِبِ إِنَّا لَقَٰدِرُونَ﴾، [المعارج - ٤٠].

گومانیان له قورئان کرد، وه وتیان : چۆن دەکرێ ئەمانە لە کەلامی موحکەم بن؟

- ئیمامی أحمد لە ڕەددی ئەوان دەڵێت - ئەمما فەرمایشتی الله تعالى : ﴿رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ﴾، ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە شەو و ڕۆژ تێیدا یەکسان دەبن، الله سوێند دەخوات بە ڕۆژهەڵاتن و ڕۆژئاوابوونی .

وە ئەم فەرمایشتە : ﴿رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ﴾، ئەمە درێژترین ڕۆژە لە ساڵدا، وە کورتترین ڕۆژە لە ساڵدا، الله سوێند بە ڕۆژهەڵات و ئاوابوونی ئەو دوو ڕۆژە دەخوات .

وە ئەم فەرمایشتە : ﴿بِرَبِّ ٱلْمَشَٰرِقِ وَٱلْمَغَٰرِبِ إِنَّا لَقَٰدِرُونَ﴾، ئەوە ڕۆژهەڵاتنەکان و ڕۆژئاوابوونەکانی ساڵە .

جا ئەمە بوو کە زەندیقەکان گومانیان تێیدا بۆ دروست بوو .

—

: لێرەدا گومانی زەندیقەکان تاک و کۆی وشەی (مشرق و مغرب) بوو .



٨ - وأما قوله عَزَّ وَجَلَّ : ﴿وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾ [الحج : ٤٧].

وقال في آيةٍ أُخرى : ﴿يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾ [السجدة : ٥].

وقال في آيةٍ أُخرى : ﴿تَعْرُجُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ * فَٱصْبِرْ صَبْرًا جَمِيلًا﴾ [المعارج : ٤، ٥].

فقالوا : كيف يكون هذا من الكلام المحكم؟ وهو ينقض بعضه بعضًا.

قال : أما قوله : ﴿وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾، فهذا من الأيام التي خلق الله فيها السمٰوات والأرض، خلقها في ستة أيام كل يوم مقداره ألف سنة .

وأما قوله : ﴿يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ﴾، وذلك أن جبرائيل كان ينزل إلى النبي ﷺ ويصعد إلى السماء في يومٍ كان مقداره ألف سنة، وذلك أنه من السماء إلى الأرض مسيرة خمسمائة سنة، فهبوطٌ خمسمائة عام، وصعودٌ خمسمائة عام، فذلك ألف سنة.

وأما قوله : ﴿فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ﴾، يقول: لو ولي حساب الخلائق غير الله، ما فرغ منه في يومٍ كان مقداره خمسين ألف سنة، ويفرغ الله

منه على مقدار نصف يوم من أيام الدنيا إذا أخذ في حساب الخلائق، فذلك قوله: ﴿وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ﴾ [الأنبياء: ٤٧].

يعني: لسرعة الحساب.

٨ - ئەمما فەرمايشتى الله تعالى: ﴿وَإِنَّ يَوۡمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلۡفِ سَنَةٖ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾، [الحج - ٤٧].

وە لە ئايەتێكى تردا فەرموويەتى: ﴿يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ ثُمَّ يَعۡرُجُ إِلَيۡهِ فِي يَوۡمٖ كَانَ مِقۡدَارُهُۥٓ أَلۡفَ سَنَةٖ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾، [السجدة - ٥].

وە لە ئايەتێكى تردا فەرموويەتى: ﴿تَعۡرُجُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيۡهِ فِي يَوۡمٖ كَانَ مِقۡدَارُهُۥ خَمۡسِينَ أَلۡفَ سَنَةٖ * فَٱصۡبِرۡ صَبۡرًا جَمِيلًا﴾، [المعارج - (٤ - ٥)].

وتيان: چۆن دەكرێ ئەمانە كەلامى موحكەم بن؟

لە كاتێكدا هەندێكى ئەويتريان هەڵدەوەشێنێتەوە.

- ئيمامى أحمد لە ڕەددى ئەوان دەڵێت - ئەمما ئەم قەولە: ﴿وَإِنَّ يَوۡمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلۡفِ سَنَةٖ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾، ئەوە لەو ڕۆژانەيە كە الله زەوى و ئاسمانەكانى تێدا درووست كرد، لە شەش ڕۆژدا درووستى كرد هەر ڕۆژێكى بە ئەندازەى هەزار ساڵە - واتە هەزار ساڵى ئێمە -.

وە هەروەها ئەم قەولە : ﴿يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾، ئەوەیە کە جبریل علیه السلام دادەبەزی بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ وە بەرز دەبۆوە بۆ ئاسمان لە ڕۆژێکدا کە بە ئەندازەی هەزار ساڵە، وە ئەمە لەبەر ئەوەیە کە لە نێوان ئاسمان بۆ زەوی پێنج سەد ساڵ ڕێیە، جا دابەزینی پێنج سەد ساڵە، وە بەرزبونەوەی پێنج سەد ساڵە، ئەوە هەزار ساڵ .

---

: واتە دابەزین و بەرزبونەوەی جبریل علیه السلام لەڕۆژێکدا بە ماوەی هەزار ساڵە، چونکە نێوانی زەوی و ئاسمان پێنج سەد ساڵە، نزمبوونەوە پێنج سەد ساڵ، وە بەرزبونەوە پێنج سەد ساڵ، ئیتر دەبێتە هەزار ساڵ، والله اعلم .

وە فەرمایشتی الله تعالى : ﴿فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ﴾، دەفەرموێ : ئەگەر لێپێچینەوەی دروستکراوەکان بسپێردرایە بە غەیری الله، ئەوا لێی تەواو نەدەبوو بە ڕۆژێک کە ماوەی پەنجا هەزار ساڵیش بوایە، بەڵام الله لێی تەواو دەبێ بە ئەندازەی ماوەی نیو ڕۆژ لە ڕۆژەکانی دونیا کاتێ کە لێپێچینەوە لەگەڵ دروستکراوەکان دەکات، هەروەکو فەرموویەتی : ﴿وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ﴾ [الأنبياء : ٥٧]، واتە : بەهۆی خێرایی لە لێپرسینەوەوە .

---

: گومانی زەندیقەکان لێرەدا ئەوەیە کە دەڵێن : الله لە هەندێ ئایەت بە هەزار ساڵ باسی کردووە، وە لەهەندێکیان بە پێنج هەزار ساڵ .

بەڵام ئیمامی أحمد رحمە الله باسی هەریەک لە ئایەتەکانی کرد کە مەبەست لێی چییە .



**٩** - وأما قوله : ﴿وَيَوۡمَ نَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعٗا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ أَيۡنَ شُرَكَآؤُكُمُ ٱلَّذِينَ كُنتُمۡ تَزۡعُمُونَ﴾ إلى قوله : ﴿وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشۡرِكِينَ﴾ [الأنعام : ٢٢، ٢٣] .

فأنكروا : أن كانوا مشركين.

وقال في آيةٍ أُخرى : ﴿وَلَا يَكۡتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثٗا﴾ [النساء : ٤٢].

فشكُّوا في القرآن، وزعموا أنه متناقض.

أما قوله : ﴿وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشۡرِكِينَ﴾ [الأنعام : ٢٣]، وذلك أن أهل الشرك إذا رأوا ما يتجاوز الله عن أهل التوحيد يقول بعضهم لبعض:

إذا سألنا نقول: لم نكن مشركين، فلما جمعهم الله، وجمع أصنامهم، وقال: ﴿أَيۡنَ شُرَكَآؤُكُمُ ٱلَّذِينَ كُنتُمۡ تَزۡعُمُونَ﴾ [الأنعام : ٢٢].

قال الله عَزَّ وَجَلَّ : ﴿ثُمَّ لَمۡ تَكُن فِتۡنَتُهُمۡ إِلَّآ أَن قَالُواْ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشۡرِكِينَ﴾ [الأنعام : ٢٣].

فلما كتموا الشرك؛ ختم الله على أفواههم، وأمر الجوارح، فنطقت بذلك، فذلك قوله: ﴿ٱلۡيَوۡمَ نَخۡتِمُ عَلَىٰٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَتُكَلِّمُنَآ أَيۡدِيهِمۡ وَتَشۡهَدُ أَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ﴾ [يس : ٦٥] .

فأخبر الله عَزَّ وَجَلَّ: عن الجوارح حين شهدت، فهذا تفسير ما شكَّت فيه الزنادقة.

٩ - وه ئه‌مما فه‌رمایشتی الله تعالى : ﴿وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ أَيْنَ شُرَكَآؤُكُمُ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ﴾ تاوه‌كو : ﴿وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾، [الأنعام.(٢٢ - ٢٣)] .

نكۆڵیان كرد : كه مشریك بن .

وه له ئایه‌تێكی تر فه‌رموویه‌تی : ﴿وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا﴾، [النساء - ٤٢]

.

جا گومانیان له قورئان كرد، وه پێیان وابوو هه‌ڵوه‌شێنه‌ره‌وه‌ی یه‌كتره .

---

: لێره‌دا زه‌ندیقه‌كان ده‌ڵێن : ئه‌وه‌تا الله له ئایه‌تێك باس له‌وه ده‌كات كه كاتێك موشریكه‌كان حه‌شر ده‌كرێن سوێند ده‌خۆن كه موشریك نه‌بوونه له دونیادا، وه له ئایه‌ته‌كه‌ی دواتر باس له‌وه ده‌كات كه هیچ كه‌س هیچ شتێك له الله ناشارێته‌وه .

- به‌ڵام ئیمامی أحمد ڕه‌ددیان ئه‌داته‌وه و ده‌ڵێت : - ئه‌مما فه‌رمایشتی الله تعالى : ﴿وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾، ئه‌وه ئه‌هلی شیركه كاتێ ده‌بینن الله تعالى چاوپۆشی له ئه‌هلی ته‌وحیدی ده‌كات هه‌ندێكیان به ئه‌ویتریان ده‌ڵێت : ئه‌گه‌ر

پرسیاری لێمان کرد دەڵێین : ئێمە موشریک نەبووین، کاتێ الله کۆیان دەکاتەوە، وە بتەکانیشیان کۆدەکاتەوە، وە فەرمووی : ﴿أَيۡنَ شُرَكَآؤُكُمُ ٱلَّذِينَ كُنتُمۡ تَزۡعُمُونَ﴾ .

الله تعالى دەفەرموویت : ﴿ثُمَّ لَمۡ تَكُن فِتۡنَتُهُمۡ إِلَّآ أَن قَالُواْ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشۡرِكِينَ﴾، [الأنعام: ٢٣] .

جا کاتێك شیرکەکەیان دەشارنەوە و نایڵێن، الله تعالى مۆر لەسەر دەمیان دەدات، وە فەرمان بە ئەندامەکانی لەشیان دەکات، جا بەهۆیەوە بە قسە دێن، ئەمە ئەم فەرمایشتەیە : ﴿ٱلۡيَوۡمَ نَخۡتِمُ عَلَىٰٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَتُكَلِّمُنَآ أَيۡدِيهِمۡ وَتَشۡهَدُ أَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ﴾، [يس - ٦٥] .

جا الله تعالى دەربارەی ئەندامەکانی لاشە ڕایگەیاندووە لەو کاتەی شاهێدی دەدەن، ئا ئەمە تەفسیری ئەوەیە کە زەندیقەکان تێیدا بەگومان بوون .



١٠ - أما قوله عَزَّ وَجَلَّ : ﴿وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُقۡسِمُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ مَا لَبِثُواْ غَيۡرَ سَاعَةٖۚ﴾ [الروم: ٥٥] .

وقال : ﴿يَتَخَٰفَتُونَ بَيۡنَهُمۡ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا عَشۡرٗا﴾ [طه : ١٠٣].

وقال : ﴿إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا يَوۡمٗا﴾ [طه : ١٠٤] .

وقال : ﴿إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗا﴾ [الإسراء : ٥٢] .

ومن أجل ذلك شكَّت الزنادقة.

أما قوله : ﴿إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا عَشۡرٗا﴾، قالوا ذلك إذا خرجوا من قبورهم، فنظروا إلى ما كانوا يُكذِّبون به من أمر البعث، وقال بعضهم لبعض: إن لبثتم في القبور إلَّا عشر ليالٍ، ثم استكثروا العشر، فقالوا: ﴿إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا يَوۡمٗا﴾ في القبور، ثم استكثروا اليوم، فقالوا: ﴿إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗا﴾ ثم استكثروا القليل، فقالوا : إن لبثتم إلَّا ساعة من نهار.

فهذا تفسير ما شكَّت فيه الزنادقة.

١٠ - وه ئه‌مما فه‌رمايشتى الله تعالى : ﴿وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُقۡسِمُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ مَا لَبِثُواْ غَيۡرَ سَاعَةٖۚ﴾، [الروم - ٥٥] .

وه فه‌رمووية‌تى : ﴿يَتَخَٰفَتُونَ بَيۡنَهُمۡ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا عَشۡرٗا﴾، [طه - ١٠٣] .

وه فه‌رمووية‌تى : ﴿إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا يَوۡما﴾، [طه - ١٠٤] .

وە فەرموویەتی : ﴿إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلًا﴾، [الإسراء - ٥٢] .

لەبەر ئەمە زەندیقەکان بە گومان بوون .

- بەڵام ئیمامی أحمد ڕەددیان ئەداتەوە و ئەڵێت : - ئەمما فەرمایشتی الله تعالى : ﴿إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا عَشۡرًا﴾، کاتێ لەگۆڕەکانیان دەرهێنران ئەمە دەڵێن، جا دەڕواننە ئەوەی کە زیندووبوونەوەیان لەگۆڕدا بەدرۆ دەخستەوە، جا هەندێکیان بە هەندێکی تریان دەڵێن : تەنیا دە شەو لە گۆڕدا ماوینەتەوە، پاشان بە زۆری دەزانن، بۆیە دەڵێن : ﴿إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا يَوۡما﴾، لە گۆڕەکان، پاشان ڕۆژەکەش بە زۆر دەزانن، بۆیە دەڵێن : ﴿إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلًا﴾، دواتر ئەو کەمەش بە زۆر دەزانن، جا بۆیە دەڵێن : لەناو گۆڕدا ئیللا چەند کاتێکتان بەسەربردووە لە ڕۆژدا .

جا ئەمە تەفسیری ئەوەیە کە زەندیقەکان تێیدا بە گومان بوون .



١١ - وأما قوله : ﴿يَوْمَ يَجْمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبْتُمْۖ قَالُواْ لَا عِلْمَ لَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ﴾ [المائدة : ١٠٩].

وقال في آيةٍ أُخرى : ﴿وَيَقُولُ ٱلْأَشْهَٰدُ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمْۚ﴾ [هود : ١٨].

فقالوا : كيف يكون هذا يقولون : ﴿لَا عِلْمَ لَنَآ﴾.

وأخبر عنهم أنهم يقولون : ﴿هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمْۚ﴾.

فزعموا أن القرآن ينقض بعضه بعضًا.

أما قوله : ﴿يَوْمَ يَجْمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبْتُمْۖ﴾ [المائدة: ١٠٩]، فإنه يسألهم عند زفرة جهنم، فيقول : ماذا أجبتم في التوحيد؟ فتذهب عقولهم عند زفرة جهنم، فيقولون : ﴿لَا عِلْمَ لَنَآۖ﴾ [المائدة : ١٠٩]، ثم ترجع لهم عقولهم من بعد، فيقولون : ﴿هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمْۚ﴾ [هود : ١٨].

فهذا تفسير ما شكَّت فيه الزنادقة.

١١ - ئەمما فەرمايشتى الله تعالى : ﴿يَوْمَ يَجْمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبْتُمْۖ قَالُواْ لَا عِلْمَ لَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ﴾، [المائدة-١٠٩] .

وه لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ : ﴿وَيَقُولُ ٱلْأَشْهَٰدُ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمْۚ﴾، [هود-١٨] .

- زەندیقەکان - وتیان : ئایا ئەمە چۆن دەبێت، کە دەڵێن : ﴿لَا عِلۡمَ لَنَآ﴾

.

وە دەربارەیان ڕایدەگەیەنێت کەوا دەڵێن : ﴿هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمۡۚ﴾ .

جا - زەندیقەکان - پێیان وابوو کە قورئان هەڵوەشێنەرەوەی یەکترە .

---

: واتە لێرەدا زەندیقەکان دەڵێن : الله لە ئایەتێک باس لەوە دەکات کاتێ لە نێردراوەکانی دەپرسێ قەومەکانتان چ وەڵامێکی ئێوەیان دایەوە؟

نێردراوەکانیش دەڵێن : پەروەردگارا هیچ زانیاریەکمان لەو بارەیەوە نییە .

وە الله لە ئایەتێکی تردا باس لەوە دەکات کاتێ پێغەمبەرەکان دەڵێن : ئەوانە بوون کە درۆیان دەدایە پاڵ الله و بەدرۆیان خستەوە .

زەندیقەکان پێیان وایە ئەم دوو ئایەتە هەڵوەشێنەرەوە یەکترن .

- بەڵام ئیمامی أحمد ڕەددیان دەداتەوە و دەڵێت : - فەرمایشتی الله تعالى : ﴿يَوۡمَ يَجۡمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبۡتُمۡۖ﴾، ئەو پرسیارەیان لێدەکرێت لەوکاتەی کە جەهەننەم هەناسە دەدات، دەڵێت : چ وەڵامێکتان درایەوە دەربارەی تەوحید؟

جا عەقڵیان دەڕوات و نامێنێت لەکاتی هەناسەی جەهەننەم، ئینجا دەڵێن : ﴿لَا عِلۡمَ لَنَآۖ﴾ .

پاشان لەدوایدا عەقڵیان بۆ دەگەڕێتەوە، دەڵێن : ﴿هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمۡۚ﴾ .

ئا ئەمە تەفسیری ئەوەیە کە زەندیقەکان تێیدا بەگومان بوون .



**١٢** - وأما قوله : ﴿وُجُوهٌ يَوۡمَئِذٖ نَّاضِرَةٌ * إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ [القيامة : ٢٢-٢٣] .

وقال في آيةٍ أُخرى : ﴿لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَهُوَ يُدۡرِكُ ٱلۡأَبۡصَٰرَۖ﴾ [الأنعام:١٠٣].

فقالوا : كيف يكون هذا؟!

يُخبر أنهم ينظرون إلى ربهم، وقال في آيةٍ أُخرى : ﴿لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَهُوَ يُدۡرِكُ ٱلۡأَبۡصَٰرَۖ﴾ .

فشكُّوا في القرآن، وزعموا أنه ينقض بعضه بعضًا.

أما قوله : ﴿وُجُوهٌ يَوۡمَئِذٖ نَّاضِرَةٌ﴾؛ يعني : الحُسن والبياض، ﴿إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ يعني : تُعاينُ ربها في الجنة.

وأما قوله : ﴿لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ﴾ [الأنعام : ١٠٣]؛ يعني: في الدنيا دون الآخرة.

وذلك أن اليهود قالوا لموسى : ﴿أَرِنَا ٱللَّهَ جَهۡرَةٗ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ﴾ [النساء : ١٥٣]، فماتوا وعوقبوا لقولهم : ﴿أَرِنَا ٱللَّهَ جَهۡرَةٗ﴾.

وقد سألت مشركو العرب النبي ﷺ، فقالوا : ﴿أَوۡ تَأۡتِيَ بِٱللَّهِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ قَبِيلًا﴾ [الإسراء : ٩٢].

فلما سألوا النبي ﷺ هذه المسألة؛ قال الله تعالى : ﴿أَمۡ تُرِيدُونَ أَن تَسۡـَٔلُواْ رَسُولَكُمۡ كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبۡلُۗ﴾ [البقرة : ١٠٨]، حين قالوا : ﴿أَرِنَا ٱللَّهَ جَهۡرَةٗ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ﴾ الآية.

فأنزل الله سبحانه يخبر أنه : ﴿لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ﴾؛ أي: أنه لا يراه أحدٌ في الدنيا دون الآخرة، فقال : ﴿لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ﴾ يعني: في الدنيا، أما في الأخرة فإنهم يرونه .

فهذا تفسير ما شكَّت فيه الزنادقة.

**١٢** - وە ئەمما فەرمایشتی الله تعالی : ﴿وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ نَّاضِرَةٌ * إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٞ﴾، [القيامة: ٢٢-٢٣] .

وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت : ﴿لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَهُوَ يُدۡرِكُ ٱلۡأَبۡصَٰرَۖ﴾، [الأنعام-١٠٣] .

- زەندیقەکان - وتیان : ئەمە چۆن دەبێت؟

- الله تعالی - باس لەوە دەکات کە پەروەردگاریان دەبینن، وە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی : ﴿لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ﴾ .

بۆیە گومانیان لەقورئان کرد، وە پێیان وابوو کە هەڵوەشێنەرەوەی یەکترە .

- بەڵام ئیمامی أحمد ڕەددیان دەداتەوە دەڵێت : - ئەمما فەرمایشتی الله تعالی : ﴿وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ نَّاضِرَةٌ﴾، واتە : جوانی و سپیاتی .

﴿إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٞ﴾، واتە : پەروەردگاریان لە بەهەشت دەبینن .

بەڵام فەرمایشتی : ﴿لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ﴾، واتە : لە دونیا نەک لە ئاخیرەتدا

- واتە لە دونیایە کە ناتوانن الله ببینن نەک لە ئاخیرەتدا - .

لەبەرئەوەی یەهودیەکان ئەوەیان بە موسی علیه السلام وت : ﴿أَرِنَا ٱللَّهَ جَهۡرَةً فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ﴾، [النساء - ١٥٣] .

جا مردن و سزا دران بەهۆی ئەو قسەیەی کردیان : ﴿أَرِنَا ٱللَّهَ جَهۡرَةً﴾ .

موشریکانی عەرەب داوایان لە پێغەمبەر ﷺ کرد، وتیان : ﴿أَوۡ تَأۡتِيَ بِٱللَّهِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ قَبِيلًا﴾، [الإسراء - ٩٢] .

---

: واتە داوای ئەوەیان کرد کە پێغەمبەر ﷺ الله تعالی و مەلائیکەتەکان بێنێت کۆمەڵ کۆمەڵ بەچاوی خۆیان بیانبینن .

کاتێ ئەو داوایەیان لە پێغەمبەر ﷺ کرد، الله تعالی فەرمووی : ﴿أَمۡ تُرِيدُونَ أَن تَسۡـَٔلُواْ رَسُولَكُمۡ كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبۡلُۗ﴾، [البقرة - ١٠٨] .

لەوکاتەی وتیان : ﴿أَرِنَا ٱللَّهَ جَهۡرَةً فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ﴾ .

---

: واته عەرەبەکان بەو شێوەیە پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد و داوای هێنانی الله و مەلائیکەتیان کرد هەروەکو چۆن جولەکەکان پێشتر داوایان لە موسى عليه السلام کرد و وتیان الله مان پیشان بدە .

پاشان الله تعالى دایبەزاند و ڕایگەیاند کە : ﴿لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ﴾، واتە : هیچ کەسێک الله نابینێت لە دونیادا نەک لە ئاخیرەت، فەرمووی : ﴿لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ﴾، واتە لە دونیادا، بەڵام لە ئاخیرەتدا ئەوان الله دەبینن .

ئەمە تەفسیری ئەوەبوو کە زەندیقەکان تێیدا بەگومان بوون .



**١٣** - وأما قول موسى: ﴿سُبۡحَٰنَكَ تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ [الأعراف: ١٤٣].

وقال السحرة: ﴿إِنَّا نَطۡمَعُ أَن يَغۡفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَٰيَٰنَآ أَن كُنَّآ أَوَّلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ [الشعراء: ٥١].

وقال النبي ﷺ: ﴿إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحۡيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ إلى قوله: ﴿وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾ [الأنعام: ١٦٢، ١٦٣].

فقالوا: فكيف قال موسى: ﴿وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ [الأعراف: ١٤٣].

وقد كان قبله إبراهيم مؤمنًا، ويعقوب و إسحاق؟

فكيف جاز لموسى أن يقول: ﴿وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾؟

وقالت السحرة: ﴿أَن كُنَّآ أَوَّلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾.

وكيف جاز للنبي ﷺ أن يقول: ﴿وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾، وقد كان قبله مسلمون كثير، مثل عيسى ومن تبعه؟

فشكُّو في القرآن، وقالوا: إنه متناقض.

أما قول موسى: ﴿وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾، فإنه حين قال: ﴿قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ﴾، قال الله تعالى: ﴿لَن تَرَىٰنِي﴾، ولا يراني أحد في الدنيا إلَّا مات.

﴿فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكّٗا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقٗاۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ تُبۡتُ إِلَيۡكَ﴾ [الأعراف: ١٤٣]، من قولي: ﴿رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ﴾، ﴿وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾؛ يعني: أول المصدِّقين أنه لا يراك أحدٌ في الدنيا إلَّا مات.

وأما قول السحرة: ﴿أَن كُنَّآ أَوَّلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾؛ يعني: أول المصدِّقين بموسى من أهل مصر من القبط.

وأما قول النبي ﷺ: ﴿وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾؛ يعني: من أهل مكة.

فهذا تفسير ما شكَّت فيه الزنادقة.

**١٣** - وە هەروەها وتەی موسى عليه السلام - لێرەدا الله لەسەر زمانی موسى عليه السلام بۆمان باس دەكات نەک بڵێین فلآنە ئایەت وتەی موسى عليه السلام ە، چونكە قورئان كەلامی الله یە - : ﴿قَالَ سُبۡحَٰنَكَ تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾، [الأعراف - ١٤٣].

وە ساحیرەكانیش وتیان: ﴿إِنَّا نَطۡمَعُ أَن يَغۡفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَٰيَٰنَآ أَن كُنَّآ أَوَّلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾، [الشعراء - ٥١].

وە پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ﴿إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحۡيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ تاوەكو: ﴿وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾ [الأنعام - ١٦٢، ١٦٣].

- زەندیقەكان - وتیان: چۆن موسى وتی: ﴿وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾؟

کە لە پێش ئەو إبراهیم ئیماندار بووە، وە یعقوب و إسحاق یش علیهم السلام ئیماندار بوونە؟

چۆن دروست بووە بۆ موسى کە بڵێت : ﴿وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾؟

وە ساحیرەکانیش وتیان : ﴿أَن كُنَّآ أَوَّلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ .

وە چۆن دروست بووە بۆ پێغەمبەر ﷺ کە بڵێت : ﴿وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾؟، لە کاتێکدا لە پێش ئەو مسوڵمانی زۆر هەبوون، وەک عیسى و ئەوانەی شوێنی کەوتبوون؟

جا گومانیان لە قورئان کرد، و وتیان : هەڵوەشێنەرەوەی یەکترن - واتە وتیان کە هەندێک ئایەت هەندێکی تر هەڵدەوەشێنێتەوە و دژی یەکترن - .

- ئیمامی أحمد رحمه الله ڕەددیان دەداتەوە و دەڵێت : - ئەمما وتەی موسى علیه السلام : ﴿وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾، ئەوە لەو کاتەدا بوو کاتێ وتی : ﴿قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ﴾، الله تعالى فەرمووی : ﴿لَن تَرَىٰنِي﴾، وە هیچ کەسێک من نابینێت لە دونیادا ئیللا مردووە .

﴿فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكّٗا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقٗاۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ تُبۡتُ إِلَيۡكَ﴾، لە وتەکەی : ﴿أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ﴾، ﴿وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾، [الأعراف - ١٤٣]، واتە : یەکەم بەڕاستخەرەوە بووە کە هیچ کەسێک الله نابینێت لە دونیا ئیللا مردووە .

وه ئەمما وتەی ساحیرەكان : ﴿أَن كُنَّآ أَوَّلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾، واتە : یەكەم بەڕاستخەرەوەی موسى علیه السلام لە ئەهلی مصر لە قبط - قبط خەڵكی ئەوكاتەی مصر بوونە - .

وه ئەمما وتەی پێغەمبەر ﷺ : ﴿وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾، واتە : لە ئەهلی مەككە .

ئا ئەمە تەفسیری ئەوەیە كە زەندیقەكان تێیدا بەگومان بوون .



**١٤-** وأما قوله الله عَزَّ وَجَلَّ: ﴿أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ﴾ [غافر: ٤٦]

.

وقال في آيةٍ أُخرى : ﴿فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابٗا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدٗا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ [المائدة : ١١٥].

وقال في آيةٍ أُخرى : ﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ﴾ [النساء : ١٤٥].

فشكُّو في القرآن، وقالوا: إنه يُنقض بعضه بعضًا .

أما قوله : ﴿أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ﴾؛ يعني : أشدَّ عذاب ذلك الباب الذي هم فيه.

وأما قوله : ﴿فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابٗا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدٗا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾، وذلك أن الله مسخهم خنازير، فعذَّبهم بالمسخ بما لم يُعذب به من سواهم من الناس.

وأما قوله : ﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ﴾: لأن جهنم لها سبعة أبوابٍ: جهنم، ولظى، الحُطمة، وسقر، والسعير، والجحيم، والهاوية، وهم في أسفل درك فيها.

**١٤** - وه ئه‌مما فه‌رمايشتى الله تعالى : ﴿أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ﴾، [غافر - ٤٦] .

وه له ئايه‌تێكی تردا فه‌رموویه‌تی : ﴿فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدًا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾، [المائدة - ١١٥] .

وه له ئايه‌تێكی تردا فه‌رموویه‌تی : ﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ﴾، [النساء - ١٤٥] .

جا گومانیان له قورئان كرد، و وتیان : هه‌ڵوه‌شێنه‌ره‌وه‌ی یه‌كترن .

- ئیمامی أحمد رحمه الله ڕه‌ددیان ده‌داته‌وه و ده‌ڵێت : - وه ئه‌مما فه‌رمایشتی الله تعالى : ﴿أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ﴾، واته : سه‌خترین سزا له‌و ده‌رگایه‌یه كه ئه‌وانی تێدایه .

وه ئه‌مما فه‌رمایشتی الله تعالى : ﴿فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدًا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾، وه ئه‌وه‌ش الله تعالى ئه‌وانی گۆڕی بۆ به‌راز، الله تعالى سزای دان به گۆڕینیان بۆ شێوه‌یه‌كی ناشرین كه هیچ كه‌سێكی له خه‌ڵكی به‌وه سزا نه‌داوه جگه له‌وان .

وه ئه‌مما فه‌رمایشتی الله تعالى : ﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ﴾، چونكه جه‌هه‌ننه‌م حه‌وت ده‌رگای هه‌یه : جهنم، لظى، الحطمة، سقر، السعير، الجحيم، الهاوية، ئه‌وانیش له چینی خواره‌وه‌ی جه‌هه‌ننه‌من .



**١٥** - وأما قوله الله تعالى : ﴿لَّيۡسَ لَهُمۡ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٖ﴾ [الغاشية : ٦].

ثم قال : ﴿إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ (٤٣) طَعَامُ ٱلۡأَثِيمِ﴾ [الدخان : ٤٤، ٤٥]، فقد أخبر أن لهم طعامًا غير الضريع .

فشكُّو في القرآن، وزعموا أنه مُتناقض.

أما قوله : ﴿لَّيۡسَ لَهُمۡ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٖ﴾، يقول : ليس لهم طعام في ذلك الباب ﴿إِلَّا مِن ضَرِيعٖ﴾، ويأكلون الزقوم في غير ذلك الباب، فذلك قوله : ﴿إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ (٤٣) طَعَامُ ٱلۡأَثِيمِ﴾.

فهذا تفسير ما شكَّت فيه الزنادقة.

**١٥** - وه‌ ئه‌مما فه‌رمایشتی الله تعالی : ﴿لَّيۡسَ لَهُمۡ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٖ﴾، [الغاشية - ٦] .

پاشان فه‌رموویه‌تی : ﴿إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ (٤٣) طَعَامُ ٱلۡأَثِيمِ﴾، [الدخان] .

جا ڕایگه‌یاندووه‌ كه‌ خواردنێكی دیكه‌یان هه‌یه‌ جگه‌ له‌ دڕكی وشك و تفت و تاڵ .

بۆیه‌ گومانیان له‌ قورئان كرد، و پێیان وابوو هه‌ڵوه‌شێنه‌ره‌وه‌ی یه‌كترن

.

: واته وتيان : الله له ئایه‌تێک باس له‌وه ده‌کات که جگه له دڕکێکی وشک و تاڵ هیچیان پێ نادرێت، وه له ئایه‌تێکی تر باس له‌وه ده‌کات که له داری ژه‌قنه‌بووت ده‌خۆن، جا ئیمامی أحمد له ڕه‌ددی ئه‌واندا ده‌ڵێت :

ئه‌مما فه‌رمایشتی الله تعالی : ﴿لَّيۡسَ لَهُمۡ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ﴾، [الغاشية - ٦]، ده‌ڵێت : هیچ خواردنێکیان بۆ نییه له‌و ده‌رگایه‌وه، ﴿إِلَّا مِن ضَرِيعٍ﴾، وه خواردنی ژه‌قنه‌بووت ده‌خۆن له ده‌رگایه‌کی دیکه‌وه، ئه‌مه ئه‌و فه‌رمایشته‌ی الله تعالی یه : ﴿إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ (٤٣) طَعَامُ ٱلۡأَثِيمِ﴾، [الدخان] .

جا ئه‌مه ته‌فسیری ئه‌وه‌بوو که زه‌ندیقه‌کان گومانیان لێی هه‌بوو .



١٦ - وأما قوله: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوۡلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَأَنَّ ٱلۡكَٰفِرِينَ لَا مَوۡلَىٰ لَهُمۡ﴾ [محمد: ١١].

ثم قال في آيةٍ أُخرى: ﴿ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوۡلَىٰهُمُ ٱلۡحَقِّۚ﴾ [الأنعام: ٦٢].

فقالو: كيف يكون هذا من الكلام المُحكم؟! يُخبر أنه مولى من آمن، ثم قال: ﴿وَأَنَّ ٱلۡكَٰفِرِينَ لَا مَوۡلَىٰ لَهُمۡ﴾ [محمد: ١١].

فشكُّوا في القرآن.

أما قوله: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوۡلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾، يقول ناصُر الذين آمنوا، و ﴿وَأَنَّ ٱلۡكَٰفِرِينَ لَا مَوۡلَىٰ لَهُمۡ﴾ يقول الله لا ناصر لهم.

وأما قوله: ﴿ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوۡلَىٰهُمُ ٱلۡحَقِّۚ﴾ [الأنعام: ٦٢]؛ لأن في الدنيا أرباباً باطلة.

فهذا تفسير ما شكَّت فيه الزنادقة.

١٦ - وه ئه‌مما فه‌رمایشتی الله تعالى: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوۡلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَأَنَّ ٱلۡكَٰفِرِينَ لَا مَوۡلَىٰ لَهُمۡ﴾، [محمد - ١١].

پاشان له‌ ئایه‌تێكی تردا فه‌رموویه‌تی: ﴿ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوۡلَىٰهُمُ ٱلۡحَقِّۚ﴾، [الأنعام - ٦٢].

- زه‌ندیقه‌كان - وتیان: چۆن ده‌كرێت ئه‌مانه‌ كه‌لامی موحكه‌م بن؟

الله ڕایدەگەیەنێت کەوا سەرخەری ئەوانەیە کە باوەڕیان هێناوە، پاشان فەرموویەتی : ﴿وَأَنَّ ٱلۡكَٰفِرِينَ لَا مَوۡلَىٰ لَهُمۡ﴾، [محمد - ١١] .

بۆیە گومانیان لە قورئان کرد .

- ئیمامی أحمد لە ڕەددی ئەواندا دەڵێت :- ئەمما فەرمایشتی الله تعالى : ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوۡلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾، دەڵێت : سەرخەری ئەوانەیە کە باوەڕیان هێناوە، ﴿وَأَنَّ ٱلۡكَٰفِرِينَ لَا مَوۡلَىٰ لَهُمۡ﴾، دەفەرموێت : ئەوان سەرخەریان نییە .

وە هەروەها فەرمایشتی الله : ﴿ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوۡلَىٰهُمُ ٱلۡحَقِّۚ﴾، لەبەر ئەوەی لەدونیادا شتانێکی باتڵ و پووچەڵ دەپەرسترێن .

ئا ئەمە تەفسیری ئەوەبوو کە زەندیقەکان گومانیان لێی هەبوو .



١٧ - وأما قوله: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ﴾ [المائدة: ٤٢].

وقال في آيةٍ أُخرى: ﴿وَأَمَّا ٱلۡقَٰسِطُونَ فَكَانُواْ لِجَهَنَّمَ حَطَبًا﴾ [الجن: ١٥].

فقالوا: كيف يكون هذا من الكلام المُحكم؟

أما قوله: ﴿وَأَمَّا ٱلۡقَٰسِطُونَ فَكَانُواْ لِجَهَنَّمَ حَطَبًا﴾؛ يعني: العادلون بالله، الذين يجعلون له عدلاً من خلقه فيعبدونه مع الله.

أما قوله: ﴿وَأَقۡسِطُوٓاْۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ﴾ [الحجرات: ٩].

يقول: اعدلوا فيما بينكم وبين الناس، إن الله يُحب الذين يعدلون.

وقال في آيةٍ أُخرى: ﴿أَءِلَٰهٞ مَّعَ ٱللَّهِۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٞ يَعۡدِلُونَ﴾ [النمل: ٦٠]؛ يعني: يشركون.

فهذا تفسير ما شكَّت فيه الزنادقة.

١٧ - وه هەروەها فەرمايشتى الله تعالى: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ﴾، [المائدة - ٤٢].

وه لە ئايەتێكى تردا فەرموويەتى: ﴿وَأَمَّا ٱلۡقَٰسِطُونَ فَكَانُواْ لِجَهَنَّمَ حَطَبًا﴾، [الجن - ١٥].

- زەنديقەكان - وتيان: چۆن دەكرێت ئەمە لە كەلام و ئايەتى موحكەم بێت؟

- ئیمامی أحمد له ڕەددی ئەواندا دەڵێت : - ئەمما فەرمایشتی الله تعالی : ﴿وَأَمَّا ٱلۡقَٰسِطُونَ فَكَانُواْ لِجَهَنَّمَ حَطَبًا﴾، واته : یەکسان کاران به الله، ئەوانەی کەوا شتانێک له دروستکراوەکان یەکسان دەکەن به الله و پاشان لەگەڵ الله دا دەیپەرستن .

وه هەروەها : ﴿وَأَقۡسِطُوٓاْۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ﴾، [الحجرات - ٩] .

دەفەرمووێت : دادپەروەری لەنێوان خۆتان و خەڵکیدا بکەن، الله ئەوانەی خۆشدەوێت کە دادپەروەری ئەنجام دەدەن .

وه له ئایەتێکی تردا فەرموویەتی : ﴿أَءِلَٰهٞ مَّعَ ٱللَّهِۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٞ يَعۡدِلُونَ﴾، [النمل - ٦٠] .

واته : شیرک دەکەن .

جا ئەمە تەفسیری ئەوەبوو کە زەندیقەکان گومانیان لێی هەبوو .



١٨ - وأما قوله : ﴿وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ﴾ [التوبة : ٧١].

وقال في آيةٍ أُخرى : ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يُهَاجِرُواْ مَا لَكُم مِّن وَلَٰيَتِهِم مِّن شَيۡءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْۚ﴾ [الأنفال : ٧٢] .

فكان هذا عند من لا يعرف معناه ينقض بعضه بعضًا.

أما قوله : ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يُهَاجِرُواْ مَا لَكُم مِّن وَلَٰيَتِهِم مِّن شَيۡءٍ﴾؛ يعني : من الميراث، وذلك أن الله عَزَّوَ جَلَّ حكم على المؤمنين لما هاجروا إلى المدينة أن لا يتوارثوا إلَّا بالهجرة، فإن مات رجلٌ بالمدينة مهاجرٌ مع النبي ﷺ، وله أولياء بمكة لم يهاجروا كانوا لا يتوارثون، وكذلك إن مات رجل بمكة وله وليٌّ مهاجر مع النبي ﷺ كان لا يرثه المهاجر؛ فذلك قوله : ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يُهَاجِرُواْ مَا لَكُم مِّن وَلَٰيَتِهِم مِّن شَيۡءٍ﴾، من الميراث ﴿حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْۚ﴾ فلما كثر المهاجرون ردَّ الله الميراث على الأولياء هاجروا أو لم يهاجروا، فذلك قوله ﴿وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ﴾ [الأحزاب : ٦] .

وأما قوله : ﴿وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ﴾؛ يعني: في الدين، والمؤمن يتولَّى المؤمن في دينه .

فهذا تفسير ما شكَّت فيه الزنادقة .

١٨ - وه هەروەها فەرمایشتی الله تعالى : ﴿وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ﴾، [التوبة - ٧١] .

وە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی : ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يُهَاجِرُواْ مَا لَكُم مِّن وَلَٰيَتِهِم مِّن شَيۡءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْۚ﴾، [الأنفال - ٧٢] .

جا ئەمە لە لای ئەوەی ماناکەی نازانێت پێی وایە هەڵوەشێنەرەوەی یەکترن .

- ئیمامی أحمد لە ڕەددی ئەواندا دەڵێت :- ئەمما فەرمایشتی الله تعالی : ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يُهَاجِرُواْ مَا لَكُم مِّن وَلَٰيَتِهِم مِّن شَيۡءٍ﴾، واتە لە میراتدا، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە الله تعالی حوکمی کرد بەسەر ئیمانداران لەو کاتەی هیجرەتیان کرد بۆ مەدینە بەوەی کە هیچ میراتێک نەگرن ئیللا بە هیجرەت کردن نەبێت، جا ئەگەر پیاوێک لە مەدینە مرد لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ هیجرەتی کردبوو، وە پیاوەکەش دۆست و پشتیوانی هەبوو لە مەککە و هیجرەتیان نەکردبوو ئەوا میراتی لێ وەرناگرن، وە بەهەمان شێوە گەر پیاوێک لە مەککە مرد وە دۆستێکی هیجرەتکاری هەبوو لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ئەوا هیجرەتکارەکە میراتی لێ وەرناگرێت، ئەمە ئەو فەرمایشتەی الله تعالی یە : ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يُهَاجِرُواْ مَا لَكُم مِّن وَلَٰيَتِهِم مِّن شَيۡءٍ﴾، لە میراتدا، ﴿حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْۚ﴾، جا کاتێ ژمارەی ئەوانەی هیجرەتیان کرد زۆربوو الله تعالی میراتی بۆ ئەو دۆستانەی هیجرەتیان کردبوو وە ئەوانەشی نەیانکردبوو گەڕاندەوە، ئەمەش ئەو فەرمایشتەی الله تعالی یە : ﴿وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ﴾، [الأحزاب - ٦] .

وه هەروەها : ﴿وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍۚ﴾، واته : لەديندا - سەرخەر و پشتيوانی يەكترن - ، وه ئيماندار دۆستايەتی ئيماندار دەكات لە پێناو دينەكەی .

ئا ئەمە تەفسيری ئەوەبوو كە زەنديقەكان گومانيان لێ هەبوو .



**١٩** - وأما قوله جلَّ ثناؤه لإبليس : ﴿إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ﴾ [الحجر: ٤٢] .

وقال موسى حين قتل النفس : ﴿هَٰذَا مِنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾ [القصص : ١٥] فشكُّوا في القرآن، وزعموا أنه مُتناقض .

أما قوله : ﴿إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ﴾، يقول: عباده الذين استخلصهم الله لدينه ليس لإبليس عليهم سلطان أن يُضلَّهم في دينهم أو في عبادة ربهم، ولكنه يُصيب منهم من قِبَلِ الذنوب، فأما في الشرك فلا يقدر إبليس أن يضلهم عن دينهم؛ لأن الله سبحانه استخلصهم لدينه.

وأما قوله موسى : ﴿هَٰذَا مِنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾؛ يعني: من تزيين الشيطان، كما زيَّن ليوسف ولآدم وحواء، وهم عباد الرحمٰن المخلصون.

فهذا تفسير ما شكَّت فيه الزنادقة.

**١٩** - وە هەروەها فەرمایشتی الله تعالی بۆ ئیبلیس : ﴿إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ﴾، [الحجر - ٤٢] .

وە موسی لەوکاتەی کەسێکی کوشت وتی : ﴿هَٰذَا مِنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾، [القصص : ١٥] .

جا گومانیان لەقورئان کرد، وە پێیان وابوو کە هەڵوەشێنەرەوەی یەکترن .

- ئیمامی أحمد ڕەدیان دەداتەوە و دەڵێت : - ئەمما فەرمایشتی الله تعالی : ﴿إِنَّ عِبَادِى لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٌ﴾، دەفەرمووێت : الله ئەو بەندانەی کە تایبەتی کردوون بۆ دینەکەی ئیبلیس دەسەڵاتی نیە بەسەریاندا کە گومڕایان بکات لە دینەکەیان یان لە پەرستنی پەروەردگاریان، بەڵکو ئیبلیس تووشیان دەبێت لەڕووی گوناهەوە - واتە بەهۆی تاوانەوە بۆیان دەچێت و تاوانیان پێدەکات - ، بەڵام لە ڕووی شیرکەوە ئیبلیس دەسەڵاتی ئەوەی نیە کە گومڕایان بکات لە دین، لەبەرئەوەی الله تعالی تایبەتی کردوون بۆ دینەکەی .

وە ئەمما قسەکەی موسی کە لە قورئاندا الله فەرموویەتی : ﴿هَٰذَا مِنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ﴾، [القصص : ١٥] .

واتە : لە ڕازاندنەوەی شەیتان، هەروەکو چۆن ڕازاندیەوە بۆ یوسف و ئادەم و حواء علیهم السلام، لە کاتێکدا ئەوان بەندەی دڵسۆز و موخلیصی الرحمن ن .

ئا ئەمە تەفسیری ئەوەبوو کە زەنادیقەکان گومانیان لێی هەبوو .



**٢٠** - وأما قول الله للكفار: ﴿ٱلۡيَوۡمَ نَنسَىٰكُمۡ كَمَا نَسِيتُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَا﴾ [الجاثية : ٣٤] .

وقال في آية أُخرى : ﴿فِي كِتَٰبٖۖ لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى﴾ [طه : ٥٢] .

فشكُّو في القرآن .

أما قوله : ﴿ٱلۡيَوۡمَ نَنسَىٰكُمۡ﴾، يقول: نترككم في النار ﴿كَمَا نَسِيتُمۡ﴾، كما تركتم العمل للقاء يومكم هذا .

وأما قوله : ﴿فِي كِتَٰبٖۖ لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى﴾ [طه : ٥٢] .

يقول : لا يذهب من حفظه ولا ينساه .

**٢٠** - وه هەروەها فەرمایشتی الله تعالی بۆ كافرەكان : ﴿الْيَوْمَ نَنْسَاكُمْ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَذَا﴾، [الجاثية : ٣٤] .

وه له ئايەتێكی تردا فەرموويەتی : ﴿فِي كِتَابٍ لَا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنْسَى﴾ [طه : ٥٢] .

جا گومانيان له قورئان كرد .

- ئيمامی أحمد له ڕەددی ئەواندا دەڵێت : - فەرمايشتی الله تعالى : ﴿الْيَوْمَ نَنْسَاكُمْ﴾، دەفەرمووێت : له ناو ئاگردا فەرامۆشتان دەكەين ﴿كَمَا نَسِيتُمْ﴾،

هەروەكو چۆن ئێوە كردەوە كردنتان بۆ گەیشتنەوە بەم ڕۆژە فەرامۆش كرد .

بەڵام فەرمایشتی : ﴿فِي كِتَابٍ لَا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنْسَى﴾، دەفەرموێت : هیچ كەسێك لەژێر پارێزبەندی ئەو دەرناچێت و لەبیریشی ناكات .



**٢١** - وأما قوله عَزَّ وَجَلَّ : ﴿وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ * قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرۡتَنِىٓ أَعۡمَىٰ وَقَدۡ كُنتُ بَصِيرًا﴾ [طه : ١٢٤، ١٢٥] .

وقال في الآيةِ الأُخرى : ﴿فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٌ﴾ [ق : ٢٢] .

فقالوا : كيف يكون هذا من الكلام المُحكم؟ يقول: إنه أعمى، ويقول : ﴿فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ﴾ فشكُّوا في القرآن.

أما قوله : ﴿وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ﴾ [طه : ١٢٤]؛ يعني: عن حُجَّته، قال: ﴿رَبِّ لِمَ حَشَرۡتَنِىٓ أَعۡمَىٰ﴾، عن حُجَّتي ﴿وَقَدۡ كُنتُ بَصِيرًا﴾ لها مخاصمًا بها، فذلك قوله : ﴿فَعَمِيَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَنۢبَآءُ يَوۡمَئِذٖ﴾، يقول : الحجج، ﴿فَهُمۡ لَا يَتَسَآءَلُونَ﴾ [القصص : ٦٦] .

وأما قوله : ﴿فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٌ﴾، وذلك أن الكافر إذا خرج من قبره شخص بصره، ولا يطرف بصره حتى يعاين جميع ما كان يُكذِّب به من أمر البعث، فذلك قوله : ﴿لَّقَدۡ كُنتَ فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا فَكَشَفۡنَا عَنكَ غِطَآءَكَ﴾، يقول: غطاء الآخرة، ﴿فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٌ﴾ يحد النظر، لا يطرِف حتى يعاين جميع ما كان يُكذِّب به من أمر البعث .

فهذا تفسير ما شكَّت فيه الزنادقة.

**٢١** - وه هەروەها فەرمایشتی الله تعالى : ﴿وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى * قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِي أَعْمَى وَقَدْ كُنْتُ بَصِيرًا﴾ [طه] .

وه له ئایەتێکی تردا فەرموویەتی : ﴿فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ﴾ [ق : ٢٢] .

- زەندیقەکان - وتیان : چۆن دەکرێت ئەمە لە کەلامی موحکەم بێت؟

لە کاتێکدا لە ئایەتێک دەفەرمووێت : کوێرە، وە لەئایەتێکی تردا دەفەرمووێت : ﴿فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ﴾، جا گومانیان لە قورئان کرد .

---

: چونکە دەیانوت چۆن دەبێت الله لە ئایەتێک بفەرموێت بەچاوی کوێرەوە حەشر دەکرێن، لە ئایەتێکی تریش دەفەرموێت چاویان تیژ و بەهێزە .

- ئیمامی أحمد لە ڕەددی ئەواندا دەڵێت : - ئەمما فەرمایشتی الله تعالی : ﴿وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى﴾، واتە : لە بەڵگەکانی [واتە بەڵگەکانی خۆی نەبینێت و کوێر بێت]، دەفەرمووێت : ﴿رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِي أَعْمَى﴾، لە بەڵگەکانم ﴿وَقَدْ كُنْتُ بَصِيرًا﴾، بەوەی کە بەڵگەی زۆرم لابوو مشتومڕم پێدەکرد،

جا ئەمە فەرمایشتی الله تعالی یە کە دەفەرموێت : ﴿فَعَمِيَتْ عَلَيْهِمُ الْأَنْبَاءُ يَوْمَئِذٍ﴾، دەفەرمووێت : حوججەکان، ﴿فَهُمْ لَا يَتَسَاءَلُونَ﴾ .

---

: لە دوونیادا بەڵگە و حوجەی زۆری پێ بوو دژی خەڵکی بەکاری دەهێنا لە قیامەتدا کوێر دەبێ لە بەڵگەکانی هیچی پێ نامێنێ تا بەکاری بهێنێت دەڵێت پەروەردگار بۆ بە

کوێری حەشرت کردم لە بەڵگەکانم الله تعالى کوێریان ئەکات لە بەڵگەکانیان و هیچ بەڵگە و عوزرێکیان نامێنێت .

بەڵام فەرمایشتی : ﴿فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ﴾، ئەوەیە کە کاتێ کافر دەردەهێنرێت لە گۆڕەکەی چاوەکانی ئەبلەق دەبێت و نایتروکێنێ هەتا هەموو ئەو شتانە نەبینێ کە لە دونیادا بە درۆی دەزانی لە بابەتی زیندووبوونەوە، جا ئەمە ئەو فەرمایشتەی الله تعالى یە کە دەفەرموێت : ﴿لَقَدْ كُنْتَ فِي غَفْلَةٍ مِنْ هَذَا فَكَشَفْنَا عَنْكَ غِطَاءَكَ﴾، دەفەرمووێت : پەردەی ئاخیرەت، ﴿فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ﴾، بینینی تیژە و چاوەکانی ناتروکێنێ هەتا هەموو ئەو شتانە نەبینێ کە بە درۆی دەزانی لە بابەتی زیندبوونەوە .

ئەمە تەفسیری ئەوەبوو کە زەندیقەکان گومانیان لێی هەبوو .



**٢٢** - وأما قوله لموسى : ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَىٰ﴾ [ طه : ٤٦] .

وقال في آيةِ أُخرى : ﴿إِنَّا مَعَكُم مُّسْتَمِعُونَ﴾، [ الشعراء : ١٥] .

وقالوا : كيف قال : ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَا﴾ [طه : ٤٦] .

وقال في آيةِ أُخرى : ﴿إِنَّا مَعَكُم مُّسْتَمِعُونَ﴾ [الشعراء : ١٥] .

فشكُّوا في القرآن من أجل ذلك .

أما قوله : ﴿إِنَّا مَعَكُم﴾ فهذا في مجاز اللغة، يقول الرجل للرجل : إنا سنجري عليك رِزقًا، إنا سنفعل بك كذا خيرًا .

وأما قوله : ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَىٰ﴾ [طه : ٤٦]، فهو في جائز اللغة، يقول الرجل الواحد للرجل : سأجري عليك رِزقك، أو سأفعل بك خيرًا .

**٢٢** - وه هەروەها فەرمايشتى الله تعالى بۆ موسى عليه السلام : ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى﴾، [طه : ٤٦] .

وه لە ئايەتێكى تردا فەروويەتى :

﴿إِنَّا مَعَكُمْ مُسْتَمِعُونَ﴾، [الشعراء : ١٥] .

- زەنديقەكان - وتيان : چۆن الله فەروويەتى : ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَا﴾ .

وه لە ئايەتێكى تردا فەروويەتى : ﴿إِنَّا مَعَكُمْ مُسْتَمِعُونَ﴾ .

بەهۆی ئەمەوە گومانیان کرد لە قورئان .

- ئیمامی أحمد لە ڕەددی ئەواندا دەڵێت : - ئەمما فەرمایشتی الله تعالی : ﴿إِنَّا مَعَكُمْ﴾ ئەوە لە زمانەوانیدا مەجازە - ئەو مەجازە نیە کە متاخرین بەکاری دەهێنن واتە ئەو مەجازە نیە کە ئەهلی کەلام مەبەستیانە بەڵکو مەبەستی پێی ئەوەیە کە قسەیەکە لە زماندا جائیزە بوترێ - .

- بۆ نموونە - پیاوێک بە پیاوێک دەڵێت : ئێمە رزق و رۆزی خۆتان بۆ دەنێرین - بۆ دابین دەکەین - ، یان ئێمە خێرێکتان بۆ دەکەین .

بەڵام فەرمایشتی الله تعالی : ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى﴾، ئەو وتانەیە کە لە زماندا درووستە بوترێت، وەک ئەوەی پیاوێک بە پیاوێک بڵێت : من بژێوی ژیانت دەدەم - بۆت دابین دەکەم - یان من خێرێکت بۆ دەکەم .



**٢٣** - قال الخلال : أخبرني إبراهيم بن جعفر بن جابر، قال : ثنا محمد بن حبيب، قال : قال أحمد بن حنبل : كتبتُ من العربية أكثر مما كتب أبو عَمر و الشيباني .

**٢٣** - خلال وتى : إبراهيم بن جعفر بن جابر هەواڵی پێدام، وتی : لە محمد بن حبيب، وتی : أحمد بن حنبل : وتی : دەربارەی زمانی عەرەبی زیاترم لە أبو عمرو الشيباني نوسيوە .



**٢٤** - قال الإمام أحمد رحمه الله :

وكان الجهم وشيعته كذلك، دعوا الناس إلى المتشابه من القرآن والحديث، فضلوا وأضلوا بكلامهم بشرًا كثيرًا .

فكان مما بلغنا من أمر الجهم عدوّ الله : أنه كان من أهل خراسان، من أهل الترمذ، وكان صاحب خصومات وكلام، وكان أكثر كلامه في الله تعالى، فلقي أناسًا من المشركين يقال لهم: السُّمنية، فعرفوا الجهم، فقالوا له : فإن ظهرت حُجَّتنا عليك دخلت في ديننا، وإن ظهرت حجَّتك علينا دخلنا في دينك، فكان مما كلموا به الجهم أن قالوا له : ألست تزعم أن لك إلَهًا؟

قال الجهم : نعم.

فقالوا له : فهل رأيت إلٰهك؟

قال : لا.

قالوا : فهل سمعت كلامه؟

قال : لا.

قالوا : فشممت له رائحة؟

قال : لا.

قالوا : فوجدت له حسًّا؟

قال : لا.

قالوا : فوجدت له مجسًّا؟

قال : لا.

قالوا : فما يدريك أنه إلٰه؟

قال : فتحيَّر الجهم فلم يدرِ من يَعبُدُ أربعين يومًا.

ثم إنه استدرك حُجَّةً مثل حُجَّةِ زنادقة النصارى؛ وذلك أن زنادقة النصارى يزعمون أن الروح التي هي في عيسى ابن مريم عليه السلام هي روح الله من ذات الله، فإذا أراد أن يُحدث أمرًا دخل في بعض خلقه فتكلَّم على لسان خلقه، فيأمر بما يشاء وينهى عما يشاء، وهو روح غائب عن الأبصار.

فاستدرك الجهم حجَّة مثل هذه الحُجَّة، فقال للسُّمني:

ألست تزعم أن فيك روحًا؟

قال : نعم.

فقال : فهل رأيت روحك؟

قال : لا.

قال : فهل سمعت كلامه؟

قال: لا.

قال: فوجدت له حسًّا أو مجسًّا؟

قال: لا.

قال: فكذلك الله لا يُرى له وجه، ولا يسمع له صوت، ولا يُشم له رائحة، وهو غائب عن الأبصار، ولا يكون في مكان دون مكان.

ووجد ثلاث آياتٍ في القرآن من المُتشابه:

قوله: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ [الشورى: ١١].

وقوله: ﴿ وهْوَ اللَّهُ في السَّماواتِ وفي الأرْضِ﴾ [الأنعام: ٣].

وقوله: ﴿لَّا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الْأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾ [الأنعام: ١٠٣].

فبنى أصل كلامه على هؤلاء الآيات، وتأوَّل القرآن على غير تأويله، وكذَّب بأحاديث رسول الله ﷺ، وزعم أن من وصف من الله شيئًا مما وصف به نفسه في كتابه، أو حدَّث عنه رسوله كان كافرًا، وكان من المُشبِّهة.

فأضلَّ بكلامه بشرًا كثيرًا، وتبعه على قوله رجالٌ من أصحاب أبي حنيفة، وأصحاب عَمرو بن عُبيد بالبصرة، ووضع دين الجهمية.

فإذا سألهم الناس عن قول الله عَزَّ وَجَلّ : ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾، وما تفسيره؟

يقولون : ليس كمثله شيء من الأشياء، وهو تحت الأرضين السبع، كما هو على العرش، لا يخلو منه مكان، ولا يكون في مكانٍ دون مكان، ولم يتكلمْ، ولا يتكلمُ، ولا ينظر إليه أحدٌ في الدنيا، ولا ينظر إليه أحدٌ في الآخرة، ولا يدرك بعقل، وهو وجهٌ كله، وهو علمٌ كله، وهو سمعٌ كله، وهو بصرٌ كله، وهو نورٌ كله، وهو قدرةٌ كله، ولا يكون شيئين مختلفين، ولا يوصف بوصفين مختلفين، وليس له أعلى ولا أسفل، ولا نواحٍ ولا جوانب، ولا يمين ولا شمال، ولا هو ثقيلٌ ولا خفيف، ولا له لونٌ ولا له جسم، وليس هو بمعلوم ولا معقول، وكل ما خطر على قلبك أنه شيء تعرفه فهو على خلافه .

قال أحمد رحمه الله : فقلنا : فهو شيء؟

فقالوا : هو شيءٌ لا كالأشياء .

فقلنا : إن الشيء الذي لا كالأشياء قد عرف أهل العقل، أنه لا شيء .

فعند ذلك، تبيَّن للناس أنهم لا يُثبتون شيئًا؛ ولكنهم يدفعون عن أنفسهم الشُّنعة بما يقرون من العلانية .

فإذا قيل لهم : من تعبدون؟

قالوا : نعبد من يُدبِّر أمر هذا الخلق .

فقلنا : فهذا الذي يُدبِّر أمر هذا الخلق هو مجهولٌ لا يُعرف بصفة .

قالوا : نعم .

قلنا : قد عرف المسلمون أنكم لا تُثبتون شيئًا، وإنما تدفعون عن أنفسكم الشُّنعة بما تُظهرونه .

وقلنا لهم : هذا الذي يُدبِّر هو الذي كلَّم موسى .

قالوا : لم يتكلم، ولا يتكلم؛ لأن الكلام لا يكون إلَّا بجارحة، والجوارح عن الله منفية .

فإذا سمع الجاهل قولهم يظن أنهم من أشدِّ الناس تعظيمًا الله سبحانه، ولا يشعر أنهم إنما يعود قولهم إلى فرية في الله، ولا يعلم أنهم إنما يعود قولهم إلى ضلالة وكفر .

**٢٤ - ئیمامی أحمد بن حنبل** رحمه الله وتی :

وە جەهم - واتە جهم بن صفوان - و پەیڕەوانیشی، بانگەوازی خەڵکیان دەکرد بۆ موتەشابیهەکانی قورئان و فەرموودە، جا گومڕابوون و زۆرێکیش لە خەڵکیان گومڕا کرد بە قسەکانیان .

جا کە ئەوەی پێمان گەیشتووە لە کار و کردەوەی جەهمی دوژمنی الله ئەوەیە کە : خەڵکی خوڕاسان بووە لە ئەهلی ترمذ بووە، جەهم

کەسێک بووە کە خاوەنی مشتومڕ و عیلمی کەلام بووە، زۆربەی قسەکانی دەربارەی الله تعالی بوو - واتە دەبارەی الله تعالی و صیفات و ناوەکانی - ، گەیشت بە کۆمەڵێک لە خەڵک پێیان دەوترا السمنية، کە جەهمیان ناسی، پێیان وت : قسەت لەگەڵ دا دەکەین، ئەگەر بەڵگەکانی ئێمە زاڵ بوو بەسەر تۆدا ئەوا دێیتە دینی ئێمەوە، وە ئەگەر بەڵگەکانی تۆ زاڵ بوو بەسەرماندا ئێمە دێینە دینەکەی تۆوە، ئینجا کە قسەیان لەگەڵ جهم کرد،

پێیان وت : ئایا پێت وانیە تۆ خوایەکت هەیە - خوایەک هەیە - ؟

جهم وتی : بەڵێ .

پێیان وت : پەروەردگاری خۆتت بینیووە؟

وتی : نەخێر .

وتیان : گوێت لە قسەکانی بووە؟

وتی : نەخێر .

وتیان : بۆنت کردووە - بۆنێکی هەبێ - ؟

وتی : نەخێر .

وتیان : هەستت پێ کردوە - واتە شتێک بوونی هەبێت - ؟

وتی نەخێر .

وتیان : هەستت کردووە جەستەیەکی هەبێت؟

وتی : نەخێر .

وتیان : ئینجا تۆ چوزانی ئەوە خودایە؟

وتی : بۆیە جەهم توشی دوو دڵی بوو چل ڕۆژ نەیدەزانی چی دەپەرستێ .

پاشان جەهم بەڵگەیەکی دەست کەوت وەکو بەڵگەی نەصارا زەندیقەکان - نەک ئەو گاورانەی ئەصڵی دینەکەی خۆیان وەرگرتبوو - ، وە گاورە زەندیقەکان پێیان وابوو کە ئەو ڕۆحەی لە عیسى بن مريم دايە عليه السلام ڕۆحی اللە تعالی یە لە خودی اللە تعالی وەیە، جا ئەگەر بیەوێ فەرمانێک بکات دەچێتە لاشەی هەندێک لە دروستکراوەکانی لەسەر زمانی دروستکراوەکانی قسە دەکات، ئیتر ئەوەی بیەوێ فەرمانی پێدەکات، وە ئەوەی بیەوێ ڕێگری لێدەکات، وە ئەوە ڕۆحێکە کە نادیارە لە چاوەکان .

بۆیە جەهم بەڵگەیەکی هاوشێوەی ئەمەی دەستکەوت، بە السميني وت :

ئایە پێت وا نییە کە ڕۆحێکت هەیە؟

وتی : بەڵێ .

وتى : ئايا ڕۆحى خۆت دەبينى؟

وتى : نەخێر .

وتى : ئايا گوێت لە قسەكانى بووە؟

وتى : نەخێر .

وتى : ئايا هيچ هەستى پێدەكەى يان جەستەى هەبێت؟

وتى : نەخێر .

وتى : بە هەمان شێوە الله ڕووى نابينرێت و نيەتى، وە دەنگى نابيسترێت، وە بۆن ناكرێت، وە ئەو ونە لە چاوەكاندا، وە لەهيچ شوێنێك نييە بە بێ هيچ شوێنێك - واتە بلێى لێرەيە و لێرە نيە - .

وە جەهم سێ ئايەتى لێكچووى - متشابه - دەستكەوت :

فەرمايشتى الله تعالى : ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾، [الشورى : ١١] .

وە : ﴿وَهُوَ اللَّهُ فِي السَّمَاوَاتِ وَفِي الْأَرْضِ﴾، [الأنعام : ٣] .

وە : ﴿لَا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الْأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾، [الأنعام : ١٠٣] .

جەهم بنچينەى قسەكانى لەسەر ئەم ئايەتانە بنيادنا، وە تەئويلى قورئانى كرد جگە لەسەر غەيرى تەئويلەكەى خۆى - واتە لەسەر غەيرى ئەوەى

كە لە لایەن رسول الله ﷺ و سەلەفەوە کراوە - ، وە فەرموودەکانی رسول الله ی ﷺ بە درۆ خستەوە، وە پێی وابوو هەر کەسێک وەسفی الله تعالی بکات بە شتێک لەوەی الله تعالی وەسفی خۆی پێ کردووە لە قورئاندا، یان بەوەی رسول الله ﷺ باسی کردووە، ئەوا ئەو کەسە کافر بووە، وە بووەتە یەکێک لە موشەبیهەکان .

جا زۆرێک لە خەڵکی گومڕا کرد بە قسەکانی، وە لەسەر ئەو قسەیەی پیاوانێک لە هاوەڵانی أبي حنيفة شوێنی کەوتن، وە هاوەڵانی عمرو بن عبيد یش لە بصرة وە، جا دینی جەهمیەکانی دانا .

بۆیە کاتێ خەڵکی پرسیاریان لێ دەکردن دەربارەی فەرمایشتی الله تعالی : ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾، وە تەفسیرەکەی چییە؟

دەیانوت : هیچ شتێک هاوشێوەی نییە لە شتەکان - واتە جەهمیەکان ئیقراری ئەوە دەکەن کە الله شت نیە و بە نەبوو وەسفی دەکەن، پەنا بە الله - ، لەژێر حەوت چینی زەویە، هەروەکو چۆن لەسەر عەرشە، هیچ شوێنێک خاڵی نیە لە الله - واتە پێیان وایە الله لە هەموو شوێنێکە بە زاتی خۆی - ، وە ئەوە نیە لە شوێنێک بێت و لە شوێنێک نەبێت، هەرگیز قسەی نەکردووە، و قسەش ناکات، وە هیچ کەسێک سەیری الله ناکات لە دونیادا، وە هیچ کەسێک لە ڕۆژی دواییدا الله نابینێت، وە الله وەسف ناکرێت - بە سیفەت - ، وە بەسیفەتەکانی

و كردەوەكانی ناناسرێتەوە، وە هیچ كۆتاییەكی نییە، وە كۆتایشی نییە، وە بە عەقڵ هەستی پێناكرێ، وە ئەو هەموو ڕوویەكە، وە ئەو هەموو زانستێكە، وە ئەو هەموو بیستنێكە، وە ئەو هەموو بینینێكە، وە ئەو هەموو ڕووناكیەكە، وە ئەو هەموو توانایەكە - واتە لای ئەوان هەرچی دەبیستی و دەبینی و هەستی پێ دەكەی خودی الله یە!، پەنا بە الله لە قسەیەكی ئاوا - ، وە نابێتە دوو شتی جیاواز، وە وەسف ناكرێت بە دوو وەسفی جیاواز، وە الله سەرەوە و خوارەوەی نییە، وە تەنیشت و ڕووی نییە، وە نە لای ڕاستی هەیە نە چەپی هەیە، وە نە قورسە و نە سووكە، وە هیچ ڕەنگ و جەستەی نییە، وە الله زانراو و مەعقول نییە، وە هەر شتێك هات كە شتێك بێت تۆ بیزانی ئەوا خیلافی ئەو شتەیە .

ئیمامی أحمد بن حنبل رحمه الله وتی : وتمان : جا ئەوە شتە؟

وتیان : ئەو شتێكە وەك شتەكانی تر نا .

وتمان : - ئێوە كە دەڵێن - ئەو شتەی وەك شتی تر نییە ئەهلی عەقل بەو شتە دەڵێن هیچ شتێك .

لەپاڵ ئەمەدا، بۆ خەڵك ڕوون بویەوە كە ئەوان هیچ شتێك جێگیر ناكەن، بەڵكو ئەوان بەرگری لەخۆیان دەكەن نەكا ناویان بزڕێت لەوەی كە بە ئاشكرا دانی پێدا دەنێن .

ئەگەر پێیان بڵێیت : کێ دەپەرستن؟

وتیان : ئێمە ئەوە دەپەرستین کە کاروباری درووستکراوەکان بەڕێوە دەبات .

وتمان : ئەوەی کە کاروباری درووستکراوەکان بەڕێوە دەبات نەزانراوە و بە سیفاتەکانی ناناسرێت .

وتیان : بەڵێ .

وتمان : مسوڵمانەکان دەزانن کەوا ئێوە هیچ شتێک جێگیر ناکەن، بەڵکو بەرگری لەخۆتان دەکەن لە ناو زڕاندنتان لەوەی کە دەرتانخستووە .

بەوانمان وت : ئەوەی کاروبارەکان بەڕێوە دەبات هەر ئەوەیە کە قسەی لەگەڵ موسى عليه السلام کردووە .

وتیان : قسەی نەکردووە، و قسەش ناکات، چونکە قسەکردن ناکرێت ئیللا بە ئەندامی جەستە نەبێت - واتە ئیللا دەبێ لێوەکان بجوڵێنرێ ئینجا بە قسەکردن وەسف دەکرێت - ، وە ئەندامی جەستەش بۆ الله نەفی لێکراوە .

ئەگەر کەسێکی نەزان گوێی لە قسەکانی ئەوان بێت وا گومان دەبات کە ئەوان لەو کەسانەن کە زۆر الله تعالى بە گەورە دەزانن و بە پاکی

ڕایدەگرن، وە هەستیش ناکات کە قسەکانی ئەوان درۆیە دەربارەی الله تعالى، وە نازانێت کە قسەکانیان دەگەڕێتەوە بەرەو گومڕایی و کوفر .

**٢٥** - قال أحمد رحمه الله :

فمما يُسألُ عنه الجهمي يقال له : تجد في كتاب الله آية تُخبر عن القرآن أنه مخلوق؟!

فلا يجد .

فيقال له : فتجده في سُنَّة رسول لله ﷺ أنه قال : إن القرآن مخلوق .

فلا يجد .

فيقال له : فلمَ قلتَ؟

فسيقول : من قول الله تعالى : ﴿إِنَّا جَعَلْنَٰهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا﴾ [الزخرف : ٣] .

وزعم أن : (جعل) بمعنى : (خلق) فكل مجعول هو مخلوق، فادَّعى كلمة من الكلام المتشابه يحتجُّ بها من أراد أن يُلحد فب تنزيلها، ويبتغي الفتنة في تأويلها وذلك أن : (جعل) في القرآن من المخلوقين على وجهين :

**أ** - على معنى : التسمية.

**ب** - وعلى معنى : فعل من أفعالهم.

قوله تعالى: ﴿الَّذِينَ جَعَلُوا الْقُرْآنَ عِضِينَ﴾ [الحجر: ٩١].

قالوا: هو شِعرٌ، وأنباء الأولين وأضغاث أحلام، فهذا على معنى: التسمية.

وقال: ﴿وَجَعَلُوا الْمَلَائِكَةَ الَّذِينَ هُمْ عِبَادُ الرَّحْمَٰنِ إِنَاثًا﴾ [الزخرف: ١٩]،

يعني: أنهم سموهم إناثًا.

ثم ذكر: (جعل) على غير معنى التسمية، فقال: ﴿يَجْعَلُونَ أَصَابِعَهُمْ فِي آذَانِهِمْ﴾ [البقرة: ١٩] فهذا على معنى: فعل من أفعالهم.

وقال: ﴿حَتَّىٰ إِذَا جَعَلَهُ نَارًا﴾ [الكهف: ٩٦]، هذا على معنى: فعل هذا جعل المخلوقين.

ثم ذكر (جعل) من الله على معنى: خلق، و(جعل) على غير معنى خلق، والذي قال الله تعالى: (جعل) على معنى خلق، لا يكون إلَّا خلقًا، ولا يقوم إلَّا مقام خلق، لا يزول عنه المعنى.

فإذا قال تعالى: (جعل) على غير معنى خلق لا يكون خلقًا، ولا يقوم مقام خلق، ولا يزول عنه المعنى.

فمما قال الله تعالى عَزَّ وَجَلّ: (جعل) على معنى: (خلق): قوله: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَ﴾، [الأنعام - ١]، يعني: وخلق الظلمات والنور.

وقال : ﴿وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ﴾ [النحل : ٧٨]، يقول : وخلق لكم السمع والأبصار .

وقال : ﴿وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ آيَتَيْنِ﴾ [الإسراء : ١٢]، يقول : وخلقنا الليل والنهار آيتين.

وقال : ﴿ وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجًا﴾ [نوح : ١٦] .

وقال : ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا﴾ [الأعراف : ١٨٩] .

يقول : وخلق منها زوجها، يقول : خلق من آدم حواء .

قال : ﴿وَجَعَلَ لَهَا رَوَاسِيَ﴾ [النمل : ٦١] .

يقول : وخلق لها رواسي.

ومثله في القرآن كثير.

فهذا وما كان على مثله لا يكون إلَّا على معنى : خلق.

ثم ذكر (جعل) على معنى غير (خلق)؛ قوله : ﴿مَا جَعَلَ اللَّهُ مِنْ بَحِيرَةٍ وَلَا سَائِبَةٍ﴾ [المائدة : ١٠٣]، لا يعني : ما خلق الله من بحيرة ولا سائبة.

وقال الله تعالى لإبراهيم : ﴿إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا﴾ [البقرة : ١٢٤] .

لا يعني : إني خالقك للناس إمامًا؛ لأن خلق إبراهيم كان متقدِّمًا.

وقال إبراهيم: ﴿رَبِّ اجْعَلْ هَٰذَا الْبَلَدَ ءَامِنًا﴾ [إبراهيم: ٣٥].

وقال إبراهيم: ﴿رَبِّ ٱجْعَلْنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِي﴾ [إبراهيم: ٤٠].

لا يعنى: اخلقني مقيم الصلاة.

وقال: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ أَلَّا يَجْعَلَ لَهُمْ حَظًّا فِي ٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ [آل عمران: ١٧٦].

لا يعني: يريد الله أن لا يخلق لهم حظًّا في الآخرة.

وقال لأم موسى: ﴿إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ [القصص: ٧].

لا يعني: خالقوه من المرسلين؛ لأن الله تعالى وعد أُمَّ موسى أن يرده إليها، ثم يجعله من بعد ذلك مرسلًا.

وقال: ﴿وَيَجْعَلَ الْخَبِيثَ بَعْضَهُ عَلَىٰ بَعْضٍ فَيَرْكُمَهُ جَمِيعًا فَيَجْعَلَهُ فِي جَهَنَّمَ﴾ [الأنفال: ٣٧].

لا يعني: فيخلقه في جهنم.

قال: ﴿وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ﴾ [القصص: ٥].

لا يعني: ونخلقهم أئمة، ونخلقهم الوارثين.

وقال: ﴿فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا﴾ [الأعراف: ١٤٣].

لا يعني : خلقه دكًّا .

ومثله في القرآن كثير .

فهذا وما يكون على مثاله لا يكون على معنى : خلق .

فإذا قال الله : (جعل) على معنى خلق، وقال : (جعل) على غير معنى (خلق)، فبأيِّ حُجَّة قال الجهمي: جعل على معنى خلق ؟!

فإن ردَّ الجهمي الجعل إلى المعنى الذي وضعه الله فيه، وإلَّا كان من الذين يسمعون كلام الله ثم يُحرِّفونه من بعد ما عقلوه وهم يعلمون .

فلما قال الله : ﴿إِنَّا جَعَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا﴾ [الزخرف : ٣] .

يقول : جعله عربيًّا، جعله جعلًا على معنى فعل من أفعال الله تعالى على غير معنى خلق .

وقال في سورة الزخرف : ﴿إِنَّا جَعَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ [الزخرف : ٣] .

وقال : ﴿لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ * بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ﴾ [الشعراء : ١٩٤، ١٩٥] .

فلما جعل الله القرآن عربيًّا، ويسَّره بلسان نبيه ﷺ، كان ذلك فعلًا من أفعال الله تبارك وتعالى جعل به القرآن عربيًّا، وليس كما زعموا .

معناه : أنزلناه بلسان العرب، وقيل : بيَّناه؛ يعني : هذا بيان لمن أراد الله هداه .

**٢٥ - ئیمامی أحمد** رحمه الله وتی :

ئەوەی کە جەهمییەک پرسیاری لە بارەوە دەکات، پێی دەوترێت : ئایا لە کتابی الله تعالی ئایەتێک دەدۆزیتەوە کە باس لەوە بکات کە قورئان مەخلوقە؟

ئینجا نایدۆزیتەوە .

پێی دەوترێ : ئایا لە سوننەتی رسول الله ﷺ دەبینی کە فەرمووبێتی : قورئان مەخلوقە؟

هەر نایدۆزیتەوە .

بۆیە پێی دەوترێ : ئەی بۆچی وتت؟

لە وەڵامدا دەڵێت : لە فەرمایشتی الله تعالی : ﴿إِنَّا جَعَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا﴾ [الزخرف : ٣] .

پێی وایە کە : وشەی (جعل) ە، بە مانای خلق - درووستکردن - دێت، هەموو (جعل)کراوێک مەخلوقە - واتە پێیان وایە وشەی جعل بە مانای دروستکردن دێت جا دەڵێن هەموو جعل کراوێک مەخلوقە - ، جا بانگەشەی

وشەیەکی لە کەلامی متشابە یان کرد و بەڵگەیان پێی هێنایەوە بۆ ئەوەی نکۆڵی لە دابەزینی بکەن، وە دەیانویست فیتنە بنێنەوە لە تەئویل کردنیدا، وە ئەوەش لەبەرئەوەیە کە : (جعل) لە قورئاندا لە درووستکراوەکانە لە دوو ڕووەوە :

أ - بە مانای : ناوبردن - التسمية - .

ب - وە بە مانای : کردارێک لە کردارەکانیان .

وتەی الله تعالی : ﴿الَّذِينَ جَعَلُوا الْقُرْآنَ عِضِينَ﴾، [الحجر : ٩١] .

وتیان : ئەوە شیعرە، وە هەواڵی پێشینانە، خەوی پچڕ پچڕە، جا ئەمە بە مانای ناوبردنە .

---

: لێرەدا ئیمام ئاماژە بەوە دەدات کە (جعلوا) بەمانای درووستکردن نایەت، گەر وا بوایە دەبوو بوترێ قوڕەیش و کافران قورئانیان درووست کردووە، بە هۆی ئەم ئایەتەوە کە فەرموویەتی : ﴿الَّذِينَ جَعَلُوا الْقُرْآنَ عِضِينَ﴾، بەڵکو (جعلوا) بەمانای (التسمية : ناوبردن) دێت .

وە فەرموویەتی : ﴿وَجَعَلُوا الْمَلَائِكَةَ الَّذِينَ هُمْ عِبَادُ الرَّحْمَنِ إِنَاثًا﴾، [الزخرف : ١٩] .

واته : ناویان لێناون مێیینه - واته له فریشته‌كان - .

پاشان باسی كردووه : كه (جعل) به مانای غه‌یری ناوبردنیش دێ، فه‌رموویه‌تی : ﴿يَجْعَلُونَ أَصَابِعَهُمْ فِي آذَانِهِمْ﴾، [البقرة : ١٩]، جا ئه‌مه به مانای : كرده‌وه‌یه‌ك له كرده‌وه‌كانیان دێ .

وه فه‌رموویه‌تی : ﴿حَتَّى إِذَا جَعَلَهُ نَارًا﴾، [الكهف : ٩٦] .

ئه‌مه به مانای : كرده‌وه دێ، جا ئه‌مه جعل ی درووستكراوه‌كانه .

---

: واته (جعل) به مانای ناوبردن و وه‌سف كردن دێت وه‌ك ئه‌وه‌ی كافران ده‌یانوت ئه‌م قورئانه شعره و سحره .. هتد .

وه به‌مانای كرده‌وه‌ش دێت وه‌ك ئه‌وه‌ی مونافیقان و كافران كاتێك گوێیان له هه‌وره برووسكه ده‌بوو ده‌ستیان ده‌كرده ناو گوێیان نه‌ك به‌مانای درووست كردنی په‌نجه‌كانیان بێ،

﴿قال انفخوا﴾ ئه‌وجا وتی : به‌ده‌وریيدا ئاگر هه‌ڵكه‌ن و خۆشیكه‌ن ﴿حتى إذا جعله نارا﴾ ئه‌وانیش كاره‌كه‌یان ئه‌نجامدا تا پارچه ئاسنه‌كان هه‌موو بوونه ئاگر و سووربوونه‌وه.

جا لێره‌ش به مانای كردوه‌یه‌ك دێت .

پاشان باسی (جعل) ی کرد بۆ الله به مانای : دروستکردن، وه (جعل) لەسەر غەیری مانای دروستکردن، وه ئەوەی که الله فەرموویەتی :(جعل) لەسەر مانای خلق، تەنیا به مانای خلق دێت، وه هیچ جێگایەک ناگرێتەوه ئیللا جێگای خلق نەبێت، وه ماناکەشی لەسەری لاناچێت .

جا کاتێ الله تعالى قسه بکات : به (جعل) لەسەر غەیری مانای خلق، ئەوا نابێته مانای خلق، وه جێگای خلق ناگرێتەوه، وه ماناکەشی لەسەر لاناچێ .

---

: واته هەر کاتێک الله جعل ی لەسەر مانای خلق باس کردبوو ئەوا ناگۆڕێت و هەر مانای خەلق دەدا بەڵام ئەگەر لەسەر غەیری مانای خەلق باسی کردبوو ئەوا به هەمان شێوه ناگۆڕێت و مانای خەلق نادات .

جا لەوەی الله تعالى فەرموویەتی : که جعل بەمانای خلق دێت، لەم ئایەتانەیه :

که فەرموویەتی : ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِی خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَ ٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَـٰتِ وَٱلنُّورَ﴾، [الأنعام : ١] .

واته : وه تاریکی و ڕووناکی درووست کردووه .

وە فەرموویەتی : ﴿وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَـٰرَ﴾، [النحل : ٧٨] .

دەفەرمووێت : وە بیستن و بینینی بۆ ئێوە درووستکردووە .

وە فەرموویەتی : ﴿وَجَعَلۡنَا ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ ءَايَتَيۡنِۖ﴾، [الإسراء : ١٢] .

دەفەرمووێت : ئیمە کە شەو و ڕۆژمان درووستکردووە دوو نیشانەن - دوو بەڵگەن - .

وە فەرموویەتی : ﴿وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجًا﴾ [نوح : ١٦] .

وە فەرموویەتی : ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٍ وَٰحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا﴾، [الأعراف : ١٨٩] .

دەفەرمووێت : خێزانەکەی لێوە درووستکردووە، وە حەوای لە ئادەمی درووستکردووە .

فەرموویەتی : ﴿وَجَعَلَ لَهَا رَوَٰسِىَ﴾، [النمل : ٦١] .

دەفەرمووێت : وە شاخیشی بۆ درووستکردووە .

جا نمونەکانی لە قورئاندا زۆرن .

ئەمە و ئەوەشی لەسەر نمونەی ئەمە بە هیچ مانایەک نایەت ئیللا بەمانای : خلق نەبێت - واتە ئەم ئایەتانە و نمونەکانیان تەنیا کە جعل ی تێدا هاتووە وشەی جعل هەر بە مانای خلق دێن - .

پاشان باسی (جعل) ی کرد که به غەیری مانای (خلق) دێت، فەرموویەتی: ﴿مَا جَعَلَ اللَّهُ مِنْ بَحِيرَةٍ وَلَا سَائِبَةٍ﴾، [المائدة: ١٠٣]، بە مانای ئەوە نایەت کە بڵێ: الله بحيرة و سائبة ی دروست نەکردووە.

---

: (بَحِيرَةٍ) وشترێک بوو کە گوێیان لەت دەکرد وە شیرەکەیان بۆ طاغوتەکان دادەنا و هیچ کەسێک نەدەبوایە بیدۆشیایە.

وە سائیبەش وشترێک بووە کەسێک دەیکردە نەزر دەیانوت: ئەگەر الله لەم نەخۆشییە چاکی کردمەوە یان گەیاندمییەوە ماڵی خۆم، ئەوە بەرەڵا دەکرێ لە هەر لەوەڕێک بخوات و لە هەر ئاوێک بخواتەوە نابێت ڕێگری لێبکرێت و نابێ هیچ کەسێک سەرکەوێتە پشتی و باربکرێت الله لەم چوار جۆرە وشترە: (بەحیرە، سائیبە، وەسیلە، حام) کەڵک وەرگرتنی حەرام نەکردووە.

وە الله تعالى بە پێغەمبەر ئیبراهیم علیه السلام ی فەرموو: ﴿إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا﴾، [البقرة - ١٢٤].

بە مانای ئەوە نایەت: من تۆ بە ئیمامێک بۆ خەڵکی درووست دەکەم، چونکە درووست بوونی ئیبراهیم علیه السلام لە پێشووەوە بووە.

ئیبراهیم علیه السلام فەرمووی: ﴿رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنًا﴾، [إبراهيم: ٣٥].

وه ئیبراهیم علیه السلام فەرمووی : ﴿رَبِّ ٱجۡعَلۡنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِيۚ﴾، [إبراهيم : ٤٠] .

مانای ئەوە نییە درووستم بکەی بە نوێژکەر .

وه فەرموویەتی : ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ أَلَّا يَجۡعَلَ لَهُمۡ حَظّٗا فِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ﴾، [آل عمران : ١٧٦] .

بەمانای ئەوە نایەت : کە هیچ بەشێکیان بۆ درووست ناکات لە ڕۆژی دوایدا .

وه بە دایکی موسی علیه السلام ی فەرموو : ﴿إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيۡكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾، [القصص : ٧] .

مانای ئەوە نییە : کە درووستی دەکەین بە یەکێک لە پێغەمبەران، چونکە الله تعالی وەعدی بە دایکی موسی علیه السلام دابوو کە بۆی بگەڕێنێتەوە، پاشان لە دوای ئەوە بیکات بە نێردراو .

وه فەرمووی : ﴿وَيَجۡعَلَ ٱلۡخَبِيثَ بَعۡضَهُۥ عَلَىٰ بَعۡضٖ فَيَرۡكُمَهُۥ جَمِيعٗا فَيَجۡعَلَهُۥ فِي جَهَنَّمَۚ﴾، [الأنفال : ٣٧] .

مانای ئەوە نایەت کە : دروستیان دەکات لە جەهەننەمدا .

وه فەرموويەتی : ﴿وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِين﴾، [القصص: ٥] .

به مانای ئەوە نایەت کە: دروستیان بکەین بە پێشەوا، و دروستیان بکەین بە میراتگر .

وه فەرموويەتی : ﴿فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكًّا﴾، [الأعراف: ١٤٣] .

مانای ئەوە نییە درووستی کردبێ بە ورد و خاشی .

جا نمونەکانی لە قورئاندا زۆرن .

ئەمە و ئەوەی لەسەر ئەو شێوەیەیە بەمانای درووستکردن (خلق) نایەت .

جا الله فەرمووبێتی : جعل بە مانای خلق ، وه فەرمووبێتی جعل بە غەیری مانای (خلق)، ئەوا جەهمیەک بە چ بەڵگەیەک دەڵێ : (جعل) بەمانای (خلق) دێت؟!

جا ئەگەر جەهمییەکە جعل ی گەڕاندەوە بۆ ئەو مانایەی کە الله تعالى باسی کردووە - ئەوا باشە - ، ئەگەر نا ئەوا یەکێکن لەوانەی کە کەلامی الله دەبیستن و پاشان تەحریفی دەکەن - واتە لەسەر مانا حەقیقەتی خۆی لادەدەن - ، دوای ئەوەی کە تێگەیشتبوون و دەشیانزانی .

كە الله تعالى فەرمووى : ﴿إِنَّا جَعَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا﴾، [الزخرف : ٣] .

دەفەرموویت : كردوویەتی بە عەرەبی، كردوویەتی بە كردنێك لەسەر مانای كارێ لە كارەكانی الله تعالى لەسەر غەیری مانای خلق .

وە لە سورەتی الزخرف دەفەرموێت : ﴿إِنَّا جَعَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾، [الزخرف : ٣] .

وە فەرموویەتی : ﴿لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ * بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ﴾ [الشعراء] .

وە فەرمووی : ﴿فَإِنَّمَا يَسَّرْنَٰهُ بِلِسَانِكَ﴾، [مريم : ٩٧] .

جا كە الله تعالى قورئانی كرد بە عەرەبی، وە ئاسانی كرد لەسەر زمانی پێغەمبەرەكەی ﷺ، ئا ئەوە كارێك بوو لە كارەكانی الله تعالى كە قورئانی كردووە بە عەرەبی، نەك وەك ئەوەی ئەوان پێیان وابوو .

ماناكەی ئەوەیە : دامانبەزاندووە بە زمانی عەرەبی، وە وتراوە : ڕوونمانكردووتەوە، واتە : ئەمە ڕوونكردنەوەیەكە بۆ ئەو كەسەی كە الله ویستی لێبێت هیدایەتی بدات .



**٢٦** - ثم إن الجهمي ادَّعى أمرًا آخر، وهو من المحال .

فقال : أخبرونا عن القرآن : أهو الله تعالى، أو غير الله؟

فادَّعى في القرآن أمرًا يوهم الناس .

فإذا سُئل الجاهل عن القرآن : هو الله أو غير الله؟ فلا بُدَّ له من أن يقول بأحد القولين .

فإن قال : هو الله .

قال له الجهمي : كفرت .

وإن قال : هو غير الله .

قال : صدقت .

فلم لا يكون غير الله مخلوقًا؟

فيقع في نفس الجاهل من ذلك ما يميل به إلى قول الجهمي .

وهذه المسألة من الجهمي هي من المغاليط.

فالجواب للجهمي إذا سأل فقال : أخبرونا عن القرآن : هو الله أو غير الله؟

قيل له : إن الله - جلَّ ثناؤه - لم يقل في القرآن : إن القرآن أنا، ولم يقل : غيري، وقال : هو كلامي، فسميناه باسم سمَّاه الله به .

فقلنا: هو كلام الله فمن سمّي القرآن بما سمَّاه الله به: كان من المهتدين ومن سمَّاه باسمٍ غيره: كان من الضالين.

وقد فصل الله بين (قوله) وبين (خلقه) ولم يسمِّه قولًا فقال: ﴿أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ﴾ [الأعراف: ٥٤].

فلما قال: ﴿أَلَا لَهُ الْخَلْقُ﴾، لم يبقَ شيء مخلوق إلَّا كان داخلًا في ذلك ثم ذكر ما ليس بخلق، فقال: ﴿وَالْأَمْرُ﴾، فأمره هو قوله تبارك الله رب العالمين أن يكون قوله خلقًا.

وقال: ﴿إِنَّا أَنْزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةٍ مُبَارَكَةٍ إِنَّا كُنَّا مُنْذِرِينَ * فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ﴾ [الدخان]، ثم قال في القرآن: هو أمر من عندنا.

وقال تعالى: ﴿لِلَّهِ الْأَمْرُ مِن قَبْلُ وَمِن بَعْدُ﴾ [الروم: ٤].

يقول: لله القول من قبل الخلق، ومن بعد الخلق.

والله يخلق ويأمر، وقوله غير خلقه.

وقال: ﴿ذَٰلِكَ أَمْرُ اللَّهِ أَنزَلَهُ إِلَيْكُمْ﴾ [الطلاق: ٥].

وقال: ﴿حَتَّىٰ إِذَا جَاءَ أَمْرُنَا وَفَارَ التَّنُّورُ﴾ [هود: ٤٠].

يقول: قد جاء قولنا في أمر القرآن.

**٢٦** - پاشان جەهمیەكان بانگەشەی شتێكی تریان كرد، كە ئەویش باتڵە .

- جەهمیەكان - وتیان : پێمان بڵێن دەربارەی قورئان، ئایا قورئان الله تعالى یە، یان غەیری الله یە؟

جا بانگەشەی شتێكیان كرد لە قورئان كە خەڵك تووشی گومان و دوودڵی دەكات .

جا گەر كەسێكی نەزان پرسیاری لێكرا دەربارەی قورئان : ئایا قورئان الله یە یان غەیری الله یە؟

ئەوا حەتمەن یەكێك لەو دوو وتەیە دەڵێت - واتە یان دەڵێت الله یە، یانیش دەڵێت غەیری الله یە - .

جا ئەگەر بڵێت : قورئان الله یە .

ئەوا جەهمیەكان پێی دەڵێن : كوفرت كرد .

وە ئەگەر بڵێت : غەیری الله یە .

- جەهمیەكان - دەڵێن : ڕاستت كرد .

جا بۆچی غەیری الله مەخلوق نەبێ؟

: واته جەهمیەکان دەڵێن قورئان غەیری الله یە، هەرشتێکیش غەیری الله بێت مەخلوقە، کەواتە قورئانیش مەخلوقە، والعیاذ بالله لەو عەقیدە پیسەیان .

ئینجا لە نەفسی کەسە نەزانەکە شتێ درووست دەبێ کە مەیلی دەبات بەرەو وتەی جەهمیەکان .

وە ئەو مەسئەلەیە لە جەهمیەکانەوەیە وە لە هەڵەکانە .

جا وەڵام بۆ جەهمیەکان کاتێ پرسیاریان کرد وتیان : پێمان ڕابگەیەنە دەربارەی قورئان : ئایا الله یە، یان غەیری الله؟

پێی دەوترێ : الله جلَّ ثناؤە لە قورئاندا نەیفەرمووە : قورئان منم، وە نەیفەرمووە : غەیری منە، بەڵکو فەرموویەتی : کەلامی منە .

جا ئێمەش بەو ناوە ناومان هێناوە کە الله ناوی هێناوە .

---

: واتە الله تعالی فەرموویەتی قورئان کەلامی خۆمە، کەواتە ئێمەش هەر ئەوە دەڵێینەوە .

دەڵێین : - قورئان - کەلامی الله یە، جا هەر کەسێک ناو لە قورئان بنێ بەو ناوەی الله ناوی لێناوە، ئەوا یەکێکە لە هیدایەتدراوەکان، وە

هەرکەسێک ناوی بنێ بە غەیری ئەو ناوەی الله ناوی لێناوە، ئەوا لە گومڕایانە .

وە الله تعالى جیاکاری کردووە لە نێوان وتەکەی - قوله - لەگەڵ دروستکراوەکەی - خلقه - ، وە ناوی لە دروستکراوەکەی نەناوە وتە - قول - ، فەرموویەتی : ﴿أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ﴾ [الأعراف - ٥٤] .

جا کە فەرمووی : ﴿أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ﴾، هیچ مەخلوقێکی نەهێشتۆتەوە ئیللا دەچێتە ناویەوە - واته الخلق هەموو مەخلوقاتەکان دەگرێتەوە - ، پاشان باسی ئەوەی کردووە کە درووستکراو نیە، ﴿وَٱلۡأَمۡرُۗ﴾، جا فەرمانەکەی وتەی خۆیەتی پاکی و بێگەردی بۆ پەروەردگاری جیهانیان کە وتەکەی دروستکراو بێت .

وە فەرموویەتی : ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ * فِيهَا يُفۡرَقُ كُلُّ أَمۡرٍ حَكِيمٍ﴾، [الدخان] .

پاشان دەربارەی قورئان فەرموویەتی : ئەوە فەرمانێکە لەلایەن خۆمانەوە .

وە الله تعالى فەرموویەتی : ﴿لِلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ مِن قَبۡلُ وَمِنۢ بَعۡدُۚ﴾، [الروم - ٤] .

دەفەرمووێت : وتە بۆ الله تعالى یە پێش درووست بوونی مەخلوقەکان، وە لە پاش درووست بوونی مەخلوقەکان .

جا الله تعالى درووست دەكات و فەرمان دەكات، وتەكەشى غەير مەخلوقە .

وە فەرموويەتى : ﴿ذَٰلِكَ أَمۡرُ ٱللَّهِ أَنزَلَهُۥٓ إِلَيۡكُمۡۚ﴾، [الطلاق - ٥] .

وە فەرموويەتى : ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَمۡرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ﴾، [هود - ٤٠] .

دەفەرمووێت : وتەی ئێمە هات دەربارەی فەرمانەکانی قورئان .



# باب (٢)

## بيان ما فصَّل الله بين (قوله) و(خلقه)



**٢٧** - وذلك أن الله جلَّ ثناؤه:

**أ** - إذا سمَّى الشيء الواحد باسمين أو ثلاثة أسامٍ فهو مرسل غير مُنفصل.

**ب** - وإذا سمَّى شيئين مُختلفين لا يدعهما مرسلين حتى يفصل بينهما.

من ذلك:

قوله عَزَّ وَجَلّ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ إِنَّ لَهُۥٓ أَبٗا شَيۡخٗا كَبِيرٗا﴾ [يوسف: ٧٨].

فهذا شيء واحد سمَّاه بثلاثة أسامٍ، وهو مرسل، ولم يقل: إن له أبًا، وشيخًا، وكبيرًا.

وقال: ﴿عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبۡدِلَهُۥٓ أَزۡوَٰجًا خَيۡرٗا مِّنكُنَّ مُسۡلِمَٰتٖ مُّؤۡمِنَٰتٖ قَٰنِتَٰتٖ تَٰٓئِبَٰتٍ عَٰبِدَٰتٖ سَٰٓئِحَٰتٖ﴾، ثم قال: ﴿ثَيِّبَٰتٖ﴾ [التحريم: ٥].

فهذا اسم شيء واحد فهو مرسل، فلما ذكر شيئين مختلفين فصل بينهما، فذلك قوله: ﴿ثَيِّبَٰتٍ﴾، ثم قال : ﴿وَأَبۡكَارًا﴾، فلما كانت البِكرُ غير الثيب لم يدعه مرسلاً حتى فصل بينهما، فذلك قوله : ﴿وَأَبۡكَارًا﴾ .

وقال : ﴿وَمَا يَسۡتَوِى ٱلۡأَعۡمَىٰ﴾، ثم قال: ﴿وَٱلۡبَصِيرُ﴾ [فاطر: ١٩]، فلما كان البصير غير الأعمى فصل بينهما .

ثم قال : ﴿وَلَا ٱلظُّلُمَٰتُ وَلَا ٱلنُّورُ * وَلَا ٱلظِّلُّ وَلَا ٱلۡحَرُورُ﴾ [فاطر ٢٠، ٢١] .

فلما كان كل واحد من هذا الشيء غير الشيء الآخر فصل بينهما .

ثم قال : ﴿هُوَ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلۡمُؤۡمِنُ ٱلۡمُهَيۡمِنُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡجَبَّارُ ٱلۡمُتَكَبِّرُۚ﴾ ﴿ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُۖ﴾ [الحشر: ٢٣، ٢٤] .

فهذا كله اسم شيء واحد، فهو مرسل ليس بمُنفصل .

وكذلك إذا قال الله: ﴿أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ﴾، ثم قال: ﴿وَٱلۡأَمۡرُۗ﴾؛ لأن (الخلق) غير (الأمر)، فهو مُنفصل .

# باب (٢)

## ڕوونكردنەوە دەربارى ئەو جیاكاریەی كە الله كردوویەتی لە نێوان وتەكەی [قولە] لەگەڵ دروستكراوەكەی [خلقە]



**٢٧** - وە ئەمەش لەبەر ئەوەیە كە الله جلَّ ثناؤە :

**أ** - كاتێ ناو لە شتێك بنێت بە دوو ناو یان سێ ناو ئەوا مرسل و جیانەكراوەیە .

**ب** - وە كاتێ ناو لە دوو شتی جیاواز بنێت لێیان ناگەڕێت بە مرسل ی تاكو جیایان دەكاتەوە .

لەوانە :

فەرمایشتی الله تعالى : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ إِنَّ لَهُۥٓ أَبٗا شَيۡخٗا كَبِيرٗا﴾، [يوسف : ٧٨] .

ئەمە یەك شتە بە سێ ناو ناوی لێنراوە، وە ئەمە مرسل ە، نەیفەرمووە : باوكێك، و بەساڵاچوویەك، و بەتەمەنێكی هەیە .

وه فەرموویەتی : ﴿عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبۡدِلَهُۥٓ أَزۡوَٰجًا خَيۡرًا مِّنكُنَّ مُسۡلِمَٰتٖ مُّؤۡمِنَٰتٖ قَٰنِتَٰتٖ تَٰٓئِبَٰتٍ عَٰبِدَٰتٖ سَٰٓئِحَٰتٖ﴾، پاشان دەفەرموێت : ﴿ثَيِّبَٰتٖ﴾، [التحريم : ٥].

جا ئەمە ناوی یەک شتە بۆیە مرسل ە، بەڵام کاتێ باسی دوو شتی جیاوازی کرد جیاکاری لە نێوانیان کرد، ئەمەش ئەو فەرمایشتەیە : ﴿ثَيِّبَٰتٖ﴾، پاشان دەفەرموێت : ﴿وَأَبۡكَارٗا﴾، ئینجا کچ بوو وە بێوەژن نەبوو بە مرسل ی لێیانی نەگەڕا تاوەکو جیاکاری لە نێوانیان کرد، ئەمەش ئەو فەرمایشتەیە : ﴿وَأَبۡكَارٗا﴾ - واتە الله سبحانه وتعالى جیایکردوونەتەوە و نێوەندی خستۆتە نێوانیان بەهۆی (و) -.

وە فەرموویەتی : ﴿وَمَا يَسۡتَوِي ٱلۡأَعۡمَىٰ﴾، پاشان فەرموویەتی : ﴿وَٱلۡبَصِيرُ﴾، [فاطر - ١٩].

ئینجا کاتێ بینا کوێر نییە جیاکاری لە نێوانیان کردووە.

پاشان فەرموویەتی : ﴿وَلَا ٱلظُّلُمَٰتُ وَلَا ٱلنُّورُ * وَلَا ٱلظِّلُّ وَلَا ٱلۡحَرُورُ﴾، [فاطر : ٢٠ - ٢١].

جا کاتێ هەر شتێک لەمانە شتەکەی تریان نەبووبێ ئەوا جیاکاری لە نێوانیان کردووە.

پاشان فەرموویەتی : ﴿ٱلۡمَلِكُ ٱلۡقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلۡمُؤۡمِنُ ٱلۡمُهَيۡمِنُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡجَبَّارُ ٱلۡمُتَكَبِّرُۚ﴾ ﴿ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُۖ﴾، [الحشر : ٢٣ - ٢٤] .

ئەم ناوانە هەموویان ناوی یەک شتن، بۆیە مرسل ن و جیاکاری لە نێوانیان نەکردووە - واتە گشتیان ناوی الله تعالى یە و ناوی شتێکی جیاواز نین - .

وە بەهەمان شێوە کاتێ الله تعالى فەرموویەتی : ﴿أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ﴾، پاشان فەرموویەتی : ﴿وَٱلۡأَمۡرُۗ﴾، لەبەر ئەوەیە کە درووستکردن فەرمان دەرکردن نییە و جیایە لەو، بۆیە جیاکراونەتەوە .

---

: ڕوونکردنەوەیەک دەربارەی ئەثەری ٢٧ .

إبن بطة لە [**الإبانة الكبرى : ٢٤٧٢**] ئەم بابەتە ڕوون دەکاتەوە و دەڵێت :

لە کتێبی الله تعالى دەبینت کە باسی دوو شتی جیاوازی کردووە گەر لە شوێنێک بن ئەوا نێوەندی خستۆتە نێوانیان بە (الواو . و)، وە گەر دوو شتەکە جیاواز نەبن ئەوا نێوەندی نەخستۆتە نێوانیان بە (الواو - و) .

جا لەمانەدا هەرشتێک یەک بوو، وە ناوەکەی جیاواز بوو، وە ماناکەی موتەفیق بوو، ئەوا (الواو . و) ناخرێتە نێوانیان .

[لەمانە] :

١ - فەرمایشتی الله تعالی : ﴿قَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ إِنَّ لَهُۥٓ أَبًا شَيۡخًا كَبِيرًا﴾، نێوەند نەخراوەتە نێوانیان بە (الواو . و) کاتێ کە هەموویان یەک شتن، ئایە نابینیت باوک ئەوەیە کەسێکی بەساڵاچووی تەمەن گەورەیە؟

٢ - وە فەرموویەتی : ﴿عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبۡدِلَهُۥٓ أَزۡوَٰجًا خَيۡرًا مِّنكُنَّ مُسۡلِمَٰتٍ مُّؤۡمِنَٰتٍ قَٰنِتَٰتٍ تَٰٓئِبَٰتٍ عَٰبِدَٰتٍ سَٰٓئِحَٰتٍ ثَيِّبَٰتٍ وَأَبۡكَارًا﴾، [التحريم: ٥].

ئینجا کە وەسفی هەموویان دەکات بەیەک شت هەندێکیانی لەویتریانی جیا نەکردۆتەوە و نێوەندی نەخستۆتە نێوانیان بە (الواو . و)، پاشان فەرموویەتی : ﴿وَأَبۡكَارًا﴾، الأبکار - واتە کچەکان - ، بێوەژن نین بۆیە نێوەندی خستۆتە نێوانیان بە (الواو . و)، چونکە کچ و بێوەژن دوو شتن جیاوازن .

٣ - وە هەروەها - ئایەتێک - کەوا یەک شتە بەناوی جیاوازەوە وە بە (الواو) جیا نەکراوەتەوە :

وە فەرموویەتی : ﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلۡمُؤۡمِنُ ٱلۡمُهَيۡمِنُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡجَبَّارُ ٱلۡمُتَكَبِّرُۚ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ (٢٣) هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُۖ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ (٢٤)﴾، [سورة الحشر].

هەموویان یەک شتن و بە (الواو) نێوەند نەخراوتە نێوانیان، وە درووست نییە کە (الواو) لێرەدا دابنێیت، لەبەرئەوەی یەکەم دووەم نییە، وە دووەم سێیەم نییە - واتە درووست نییە کە حەرفی الواو بخەیتە نێوان ناوەکانی الله تعالی پێت وابێت کە السّلام، المهیمن نییە و جیاوازە، چونکە هەموو ئەمانە ناوی الله تعالی ن، ناکرێت جیایان بکەیتەوە، والله اعلم - .

ئینجا ئیمام ابن بطة رحمه الله ئایەتی زیاتر باس دەکات کە هەمان شتن و (الواو) ناخرێتە نێوانیان، وە ئەوانەشی کە (الواو) دەخرێتە نێوانیان، بەڵام إن شاء الله ئەوەندە کافیە بۆ تێگەیشتن چونکە لەهەردوو ڕووەوە نمونەی هێناوە و باسی کردووە، والله اعلم .



# باب (٣)

## بيان ما أبطل الله تبارك وتعالى أن يكون القرآن إلا وحيًا وليس بمخلوق



**٢٨** - قال قوله: ﴿وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ (١) مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمۡ وَمَا غَوَىٰ (٢) وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ (٣) إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ (٤)﴾ [سورة: النجم].

وذلك أن قريشًا قالوا: إن القرآن شِعر.

وقالوا: أساطير الأولين.

وقالوا: أضغاث أحلام.

وقالوا: تقوَّله محمد من تلقاء نفسه.

وقالوا: تعلَّمه من غيره.

فأقسم الله بالنجم إذا هوى؛ يعني القرآن إذا نزل.

فقال: ﴿وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ (١) مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمۡ﴾؛ يعني: محمدًا، ﴿وَمَا غَوَىٰ (٢) وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ (٣)﴾، يقول: إن محمدًا لم يقل هذا القرآن من تلقاء نفسه، فقال: ﴿إِنۡ هُوَ﴾؛ أي: ما هو؛ يعني: القرآن ﴿إِلَّا وَحۡيٌ يُوحَىٰ (٤)﴾، فأبطل الله أن يكون القرآن شيئًا غير الوحي، لقوله: ﴿إِنۡ هُوَ﴾، يقول: ما هو ﴿إِلَّا وَحۡيٌ يُوحَىٰ﴾.

ثم قال : ﴿عَلَّمَهُۥ﴾؛ يعني: علَّم جبريل محمداً القرآن، وهو: ﴿عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلۡقُوَىٰ (٥) ذُو مِرَّةٍ فَٱسۡتَوَىٰ (٦)﴾، إلى أن قال : ﴿فَأَوۡحَىٰٓ إِلَىٰ عَبۡدِهِۦ مَآ أَوۡحَىٰ (١٠)﴾، فسمى الله القرآن وحيًا، ولم يسمه خلقًا.

# باب (٣)

## ڕوونكردنەوە دەربارەی ئەوەی كە الله تبارك و تعالی پوچەڵی كردووەتەوە دەربارەی ئەوەی كە قورئان تەنها وەحیە و مەخلوق نییە



**٢٨** - الله تعالی فەرموویەتی : ﴿وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ (١) مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمۡ وَمَا غَوَىٰ (٢) وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ (٣) إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ (٤)﴾، [النجم : ١،٤] .

ئەمە لەبەرئەوەبوو كە قوڕەیش وتیان : قورئان شیعرە .

وە وتیان : - كە قورئان - سەرگوزەشتە و ئەفسانەی ئومەتانی پێشووترە .

وە وتیان : خەونی تێكەڵ و پێكەڵن .

وە وتیان : محمد لە نەفسی خۆیەوە دایهێناوە و هەڵی بەستووە .

وە وتیان : لە كەسانی ترەوە فێری بووە .

پاشان الله تعالی سوێندی خوارد بە ئەستێرە كە لار دەبێتەوە و ئاوا دەبێت، واتە : قورئان كە دابەزی .

فەرمووی : ﴿وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ (١) مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمۡ﴾، واتە : محمد ﷺ، ﴿وَمَا غَوَىٰ (٢) وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰ (٣)﴾، دەفەرمووێت : بەڕاستی محمد ﷺ لە نەفسی خۆیەوە دەربارەی ئەو قورئانە قسە ناکات، دەفەرموێت : ﴿إِنۡ هُوَ﴾، واتە : ئەوە تەنیا، واتە : قورئان، ﴿إِلَّا وَحۡيٌ يُوحَىٰ﴾، جا الله تعالی ئەو قسەیەیانی پوچەڵ کردەوە کە قورئان شتێک بێت لە غەیری وەحی، بەو فەرمایشتەی کە فەرمووی : ﴿إِنۡ هُوَ﴾، دەفەرمووێت : ئەو قورئانە تەنیا ﴿إِلَّا وَحۡيٌ يُوحَىٰ﴾ .

پاشان فەرموویەتی : ﴿عَلَّمَهُۥ﴾، واتە : جبریل محمد ﷺ فێری قورئان کردووە، کە ئەویش : ﴿عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلۡقُوَىٰ (٥) ذُو مِرَّةٖ فَٱسۡتَوَىٰ (٦)﴾، تاوەکو فەرمووی : ﴿فَأَوۡحَىٰٓ إِلَىٰ عَبۡدِهِۦ مَآ أَوۡحَىٰ (١٠)﴾، جا الله تعالی ناوی لە قورئان نا وەحی، وە ناوی نەنا درووستکراو .



# باب (٤)



**٢٩** - ثم إن الجهمي ادَّعى أمرًا آخر، فقال: أخبرونا عن القرآن: هو شيء؟

فقلنا: نعم هو شيء.

فقال: إن الله خلق كل شيءٍ، فلم لا يكون القرآن مع الأشياء المخلوقة، وقد أقررتم أنه شيء؟

فلعمري لقد ادَّعى أمرًا أمكنه فيه الدعوى، ولبَّس على الناس بما ادَّعى.

فقلنا: إن الله في القرآن لم يسمِّ كلامه: (شيئًا)، إنما سماه: (شيئًا الذي كان بقوله).

ألم تسمع إلى قوله تبارك وتعالى: ﴿إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَىْءٍ إِذَآ أَرَدْنَٰهُ أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾ [النحل: ٤٠].

فـ (الشيء) ليس هو قوله، إنما (الشيء الذي كان بقوله).

وقال في آيةٍ أُخرى: ﴿إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا﴾ [يس: ٨٢].

فـ (الشيء) ليس هو أمره، إنما (الشيء الذي كان بأمره).

ومن الأعلام والدلالات : أنه لا يعني كلامه مع الأشياء المخلوقة، قوله عَزَّ وَجَلَّ في الريح التي أرسلها على عادٍ : ﴿مَا تَذَرُ مِن شَيۡءٍ أَتَتۡ عَلَيۡهِ﴾ [الذاريات : ٤٢]، وقال ﴿تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّها﴾ [الأحقاف : ٢٥] .

وقد أتت تلك الريح على أشياء لم تدمِّرها: منازلهم، ومساكنهم، والجبال التي بحضرتهم، فأتت عليها تلك الريح ولم تُدمرها، وقد قال : ﴿تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأمْرِ رَبِّها﴾ .

فكذلك إذا قال : ﴿ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٍ﴾ [الرعد : ١٦]، لا يعني : نفسه، ولا علمه، ولا كلامه مع الأشياء المخلوقة.

وقال لملكة سبأ : ﴿وأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ﴾ [النمل : ٢٣] .

قد كان ملك سُليمان شيئًا ولم تؤته.

فكذلك إذا قال : ﴿خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٍ﴾ [الرعد : ١٦]، لا يعني : كلامه مع الأشياء المخلوقة.

وقال الله لموسى : ﴿واصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي﴾ [طه : ٤١] .

وقال : ﴿ويُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ﴾ [آل عمران : ٣٠] .

وقال : ﴿كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ﴾ [الأنعام : ٥٤] .

وقال عيسى : ﴿تَعْلَمُ ما فِي نَفْسِي وَلَآ أعْلَمُ ما فِي نَفْسِكَ﴾ [المائدة : ١١٦] .

قال تعالى : ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذائِقَةُ المَوْتِ﴾ [آل عمران : ١٨٥] .

فقد عرف من عقل عن الله أنه لا يعني نفسه مع الأنفس التي تذوق الموت، وقد ذكر الله عَزَّ وَجَلَّ كل نفس.

فكذلك إذا قال : ﴿خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ﴾، لا يعني: نفسه، ولا علمه، ولا كلامه مع الأشياء المخلوقة.

ففي هذا دلالة وبيان لمن عقل عن الله تعالى.

قال الإمام أحمد :

فرَحِمَ الله من تفكَّر ورجع عن القول الذي يخالف الكتاب والسُّنَّة، ولم يقل على الله إلَّا الحق، فإن الله تعالى قد أخذ ميثاق خلقه فقال تعالى : ﴿ألَمْ يُؤْخَذْ عَلَيْهِمْ مِيثاقُ الكِتابِ أنْ لا يَقُولُوا عَلى اللَّهِ إلاَّ الحَقَّ﴾ [الأعراف : ١٦٩] .

وقال في آيةٍ أُخرى : ﴿قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّىَ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلْإِثْمَ وَٱلْبَغْىَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُوا۟ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ [الأعراف : ٣٣] .

فقد حرَّم الله أن يقال عليه الكذب، وقد قال : ﴿وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ تَرَى ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ﴾ [الزمر : ٦٠] .

أعاذنا الله وإياكم من فتن المضلين.

وقد ذكر الله (كلامه) في غير موضعٍ من القرآن، فسمَّاه : (كلامًا)، ولم يسمه : (خلقًا).

قوله : ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ﴾ [البقرة : ٣٧]

وقال : ﴿حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ [التوبة : ٦]

وقال : ﴿وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ [البقرة : ٧٥]

وقال : ﴿وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ﴾ [الأعراف : ١٤٣]

وقال : ﴿قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّى ٱصْطَفَيْتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِى وَبِكَلَٰمِى﴾ [الأعراف : ١٤٤]

وقال : ﴿وكَلَّمَ اللَّهُ مُوسى تَكْلِيمًا﴾ [النساء : ١٦٤]

وقال : ﴿فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِىِّ ٱلْأُمِّىِّ ٱلَّذِى يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ﴾ [الأعراف : ١٥٨]

فأخبرنا الله عَزَّ وَجَلَّ أن النبي ﷺ كان يؤمن بالله وبكلمات الله، وقال: ﴿يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا۟ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ [الفتح : ١٥] .

وقال : ﴿قُل لَّوْ كَانَ ٱلْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّى لَنَفِدَ ٱلْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّى﴾ [الكهف : ١٠٩] .

وقال : ﴿وَإِنۡ أَحَدٌ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ [التوبة : ٦] .

ولم يقل : حتى يسمع خلق الله.

فهذه نصوص بلسان عربي مُبين، لا يحتاج إلى تفسير، هو مبينٌ بحمد الله تعالى.

# باب (٤)



**٢٩** - پاشان جەهمیەکان بانگەشەی فەرمانێکی تریان کرد، وتیان : پێمان ڕابگەیەنن دەربارەی قورئان : ئایا قورئان شتە؟

وتمان : بەڵێ شتە .

وتیان : اللّٰه هەموو شتێکی درووست کردووە، کەوایە بۆچی قورئان ناکرێت لەگەڵ شتە درووستکراوەکان بێت، خۆ ئێوەش دانتان پێیدا نا کە قورئان شتە؟

فَلَعَمري بێ گومان - کەسی جەهمی - بانگەشەی شتێکی کرد کە توانا و دەسەڵاتی بەسەردا هەبوو ئەو بانگەشەیە بکات، وە چەواشەی خەڵکیان کرد بەوەی کە بانگەشەیان بۆ کرد - وشەی فَلَعَمري دەستەواژەیەکە عەرەب بەکاری هێناوە سەلەف خیلافیان تێیدا هەبووە ئایا سوێندە یاخود نا، جا ئیمام احمد هیچ کێشەی تێدا نەدیوە و بە سوێندی نەزانیوە، واللّٰه أعلم - .

وتمان : الله تعالى لە قورئاندا ناوی لە کەلامەکەی نەناوە (شتێک)، بەڵکو ناوی بردووە بە شتێک کە بە فەرمایشتی ئەو دەبێت و ڕوودەدات .

ئایا نەتبیستووە کە الله تعالى فەرموویەتی : ﴿إِنَّمَا قَوۡلُنَا لِشَيۡءٍ إِذَآ أَرَدۡنَٰهُ أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾، [النحل - ٤٠] .

جا (شت) وتەی الله تعالى نییە، بەڵکو شتێک کە بە فەرمایشتی ئەو دەبێت و ڕوودەدات .

وە لە ئایەتێکی تر فەرموویەتی : ﴿إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا﴾ [يس - ٨٢] .

جا (شت) فەرمانی ئەو نییە، بەڵکو (ئەو شتەیە کە بە فەرمانی ئەوە) .

وە لە نیشانە و بەڵگەکان : مانای ئەوە نییە کە کەلامەکەی لەگەڵ شتە درووستکراوەکان بێت، هەر وەکو فەرمایشتی الله تعالى دەربارەی ئەو بایەی کە ناردوویەتی بۆ سەر قەومی عاد : ﴿مَا تَذَرُ مِن شَيۡءٍ أَتَتۡ عَلَيۡهِ﴾، [الذاريات - ٤٢] .

وە فەرموویەتی : ﴿تُدَمِّرُ كُلَّ شَيۡءِۭ بِأَمۡرِ رَبِّهَا﴾، [الأحقاف - ٢٥] .

جا ئەو بایە چووە سەر شتانێک وە تێکیشی نەشکاندن : ماڵەکانیان، و شوێنی نیشتەجێبوونیان، وە چیاکان کە لەوێ بوون، جا هەمان با چووە سەریان و تێکیشی نەشکاندن، وە فەرمووشیەتی : ﴿تُدَمِّرُ كُلَّ شَيۡءِۭ بِأَمۡرِ رَبِّهَا﴾ .

: واته الله ئەو بایەی ڕەوانە کردووە و فەرمووشیەتی هەموو شتێکی بە فەرمانی پەروەردگاری تێک شکاندووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شتانێکی تێک نەشکاندووە، جا وشەی (هەموو) لەم ئایەتە و هاوشێوەکانیدا مەبەستی تەنیا ئەو شتانەیە کە الله ویستی لێیان بووە .

وە بە هەمان شێوە کە الله فەرموویەتی : ﴿ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَىۡءٍ﴾، [الرعد : ١٦] .

مانای ئەوە نییە کە : نەفسی، و زانستەکەی، و کەلامەکەی لەگەڵ شتە درووستکراوەکانی تر بێت .

وە بۆ شاژنی سەبەء فەرمووی : ﴿وَأُوتِيَتۡ مِن كُلِّ شَىۡءٍ﴾، [سورة النمل : ٢٣] .

جا موڵکی سلیمان علیه السلام شتێک بوو کەچی پێشی نەبەخشی بوو .

وە بە هەمان شێوە کە فەرموویەتی : ﴿خَٰلِقُ كُلِّ شَىۡءٍ﴾، مانای ئەوە نییە کە : کەلامەکەی لەگەڵ شتە درووستکراوەکان بێت .

وه الله به موسى عليه السلام ى فەرموو : ﴿وَٱصۡطَنَعۡتُكَ لِنَفۡسِي﴾، [طه - ٤١] .

وه فەرموویەتی : ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفۡسَهُۥ﴾، [آل عمران : ٣٠] .

وه فەرموویەتی : ﴿كَتَبَ رَبُّكُمۡ عَلَىٰ نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَ﴾، [سورة الأنعام : ٥٤] .

وه عيسى عليه السلام فەرمووی : ﴿تَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِي وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَۚ﴾، [المائدة - ١١٦] .

وه الله تعالى فەرموویەتی : ﴿كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۗ﴾، [آل عمران - ١٨٥] .

جا ئەو کەسە ئاشنا بووە کە لە الله تێگەیشتووە کە واتای ئەوە نیە نەفسی ئەو لەگەڵ ئەو نەفسانە بێت کە مردن دەچێژن، کەچی الله فەرمووشیەتی هەموو نەفسێک - واتە الله فەرموویەتی هەموو نەفسێک مردن دەچێژێ، بەڵام خۆ مەبەستی نەفسی خۆی نییە چونکە الله نامرێت و هەر زیندووە - .

جا بە هەمان شێوە کە فەرموویەتی : ﴿ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ﴾ .

مانای ئەوە نییە کە : نەفسی، و زانستەکەی، و کەلامەکەی لەگەڵ شتە درووستکراوەکانی تر بێت .

جا لەمەدا بەڵگە و ڕوونکردنەوە هەیە بۆ کەسێک کە تێگەیشتبێت لە الله تعالى .

ئیمامی أحمد رحمه الله دەڵێت :

جا ڕەحمەتی الله لەو کەسەی کە بیری کردووەتەوە و گەڕاوەتەوە لەو قسەیەی کە پێچەوانەی کتاب و سوننەتە، وە هیچ شتێکی دەربارەی الله نەوتووە جگە لە حەق، چونکە بە ڕاستی الله تعالی بەڵێنی لە دروستکراوەکانی وەرگرتووە و فەرموویەتی : ﴿أَلَمۡ يُؤۡخَذۡ عَلَيۡهِم مِّيثَٰقُ ٱلۡكِتَٰبِ أَن لَّا يَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّ﴾، [الأعراف : ١٦٩] .

وە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی : ﴿قُلۡ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلۡإِثۡمَ وَٱلۡبَغۡيَ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَأَن تُشۡرِكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ سُلۡطَٰنٗا وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾، [الأعراف - ٣٣] .

بۆیە الله تعالی حەرامی کردووە کەوا لەسەری بەدرۆ قسە بکرێت، هەر وەکو فەرموویەتی : ﴿وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ تَرَى ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَى ٱللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسۡوَدَّةٌ﴾، [الزمر : ٦٠] .

الله ئێمە و ئێوەش پەنا بدات لە فیتنەی گومڕایان .

الله تعالی لە زیاتر لە شوێنێک لە قورئان باسی کەلامی خۆی کردووە، و ناوی لێناوە : کەلام،

ناوی نەناوە : دروستکراو .

الله تعالی فەرموویەتی : ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٖ﴾، [البقرة - ٣٧] .

وه فەرموویەتی: ﴿حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾، [التوبة - ٦].

وه فەرموویەتی: ﴿وَقَدۡ كَانَ فَرِيقٞ مِّنۡهُمۡ يَسۡمَعُونَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾، [البقرة - ٧٥].

وه فەرموویەتی: ﴿وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ﴾، [الأعراف - ١٤٣].

وه فەرموویەتی: ﴿قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾، [الأعراف - ١٤٤].

وه فەرموویەتی: ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا﴾، [النساء - ١٦٤].

وه فەرموویەتی: ﴿فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِيِّ ٱلۡأُمِّيِّ ٱلَّذِي يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ﴾، [الأعراف - ١٥٨].

جا الله تعالى ڕایگەیاندووە کەوا پێغەمبەر ﷺ ئیمانی بە الله و وشەکانی هێناوە، وە فەرموویەتی: ﴿يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُواْ كَلَٰمَ ٱللَّهِۚ﴾، [الفتح - ١٥].

وه فەرموویەتی: ﴿لَّوۡ كَانَ ٱلۡبَحۡرُ مِدَادٗا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّي لَنَفِدَ ٱلۡبَحۡرُ قَبۡلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّي﴾، [الكهف - ١٠٩].

وه فەرموویەتی: ﴿وَإِنۡ أَحَدٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾، [التوبة - ٦].

نەیفەرمووە: تاوەکو درووستکراوی الله ببیستێ - بەڵکو فەرموویەتی تاوەکو کەلامی الله ببیستێ -.

جا ئەمانە كۆمەڵە دەقێكن بە زمانی عەرەبی ڕوون و ئاشكرا، كە پێویستی بە تەفسیر نییە، خۆی ڕوونە بحمد الله تعالی .



# باب (٥)



**٣٠** - قال أحمد بن حنبل رحمه الله:

وقد سألت الجهمية: أليس إنما قال الله : ﴿قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ﴾، [البقرة - ١٣٦]، ﴿وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنًا﴾، [البقرة - ٨٣]، ﴿وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ﴾، [العنكبوت : ٤٦]، ﴿وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا﴾، [الأحزاب : ٧٠]، ﴿فَقُولُواْ ٱشۡهَدُواْ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ﴾ [آل عمران - ٦٤]، وقال : ﴿وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ﴾ [الكهف - ٢٩]، ﴿فَقُلۡ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡۖ﴾ [الأنعام - ٥٤] .

ولم نسمع الله يقول: قولوا : إن كلامي خلق .

وقال : ﴿وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌۚ﴾ [النساء - ١٧١] .

وقال : ﴿وَلَا تَقُولُواْ لِمَنۡ أَلۡقَىٰٓ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسۡتَ مُؤۡمِنٗا﴾ [النساء - ٩٤] .

وقال : ﴿لَا تَقُولُواْ رَٰعِنَا﴾ [البقرة - ١٠٤] .

﴿وَلَا تَقُولُواْ لِمَن يُقۡتَلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتُۢۚ﴾ [البَقَرَة : ١٥٤] .

﴿وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىْءٍ إِنِّى فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا * إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ [الكهف، ٢٣ - ٢٤].

﴿فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ﴾ [الإسراء - ٢٣].

﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ﴾ [الإسراء - ٣٦].

﴿وَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ﴾ [القصص - ٨٨].

﴿وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُم مِّنْ إِمْلَٰقٍ﴾ [الأنعام - ١٥١].

﴿وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ﴾ [الإسراء - ٢٩].

﴿وَلَا تَقْتُلُواْ ٱلنَّفْسَ﴾ [الأنعام - ١٥١].

﴿وَلَا تَقْرَبُواْ مَالَ ٱلْيَتِيمِ﴾ [الأنعام - ١٥٢].

﴿وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا﴾ [لقمان - ١٨].

ومثله في القرآن كثير.

فهذا ما نهى الله عنه في القرآن، ولم يقل لنا: لا تقولوا: إن القرآن كلامي.

وقد سَمَّت الملائكة كلام الله: (كلامًا)، ولم تسمِّه: (خلقًا)، قوله: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ قَالُواْ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ قَالُواْ ٱلْحَقَّ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ﴾ [سورة سبأ - ٢٣].

وذلك أن الملائكة لم يسمعوا صوت الوحي ما بين عيسى ومحمد صلى الله عليهما وسلم، وبينهما كذا وكذا سنة .

فلما أوحى الله إلى محمد ﷺ سمع الملائكة صوت الوحي كوقع الحديد على الصفا، فظنوا أنه أمرٌ من الساعة، ففزعوا وخرُّوا لوجوههم سجدًا، فذلك قوله : ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمۡ﴾ [سورة سبأ - ٢٣] .

يقول : حتى إذا انجلى الفزع عن قلوبهم، رفع الملائكة رؤوسهم، فسأل بعضهم بعضًا فقالوا: ماذا (قال) ربكم؟ ولم يقولوا: ماذا (خلق) ربكم .

فهذا بيان لمن أراد الله هداه .

# باب (٥)



**٣٠** - ئيمامی أحمد بن حنبل رحمه الله دەڵێت :

پرسیارم کرد لە جەهمیەکان : ئایا الله نەیفەرمووە : ﴿قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ﴾، [البقرة - ١٣٦]، ﴿وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنًا﴾، [البقرة - ٨٣]، ﴿وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ﴾، [العنكبوت : ٤٦]، ﴿وَقُولُواْ قَوۡلًا سَدِيدًا﴾، [الأحزاب - ٧٠]، ﴿فَقُولُواْ ٱشۡهَدُواْ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ﴾ [آل عمران - ٦٤]، وە فەرموویەتی : ﴿وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ﴾ [الكهف - ٢٩]، ﴿فَقُلۡ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡۖ﴾ [الأنعام - ٥٤] .

وە نەمانبیستووە کەوا الله تعالى بفەرموێت : بڵێن : کەلامی من درووستکراوە - واتە لە تەواوی قورئان بەڵگەیەک نییە کەوا باس لە درووستکراویەتی کەلامی الله بکات، والله اعلم - .

وە فەرموویەتی : ﴿وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌۚ﴾ [النساء - ١٧١] .

وە فەرموویەتی : ﴿وَلَا تَقُولُواْ لِمَنۡ أَلۡقَىٰٓ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسۡتَ مُؤۡمِنًا﴾ [النساء - ٩٤] .

وه فەرموویەتی : ﴿لَا تَقُولُواْ رَٰعِنَا﴾ [البقرة - ١٠٤] .

﴿وَلَا تَقُولُواْ لِمَن يُقۡتَلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتُۢۚ بَلۡ أَحۡيَآءٞ وَلَٰكِن لَّا تَشۡعُرُونَ﴾ [البَقَرَة : ١٥٤]

﴿وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْيۡءٍ إِنِّي فَاعِلٞ ذَٰلِكَ غَدًا * إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ﴾ [الكهف - ٢٣،٢٤] .

﴿فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفّٖ﴾ [الإسراء - ٢٣] .

﴿وَلَا تَقۡفُ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۚ﴾ [الإسراء - ٣٦] .

﴿وَلَا تَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَۘ﴾ [القصص - ٨٨] .

﴿وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُم مِّنۡ إِمۡلَٰقٖ﴾ [الأنعام - ١٥١] .

﴿وَلَا تَجۡعَلۡ يَدَكَ مَغۡلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ﴾ [الإسراء - ٢٩] .

﴿وَلَا تَقۡتُلُواْ ٱلنَّفۡسَ﴾ [الأنعام - ١٥١] .

﴿وَلَا تَقۡرَبُواْ مَالَ ٱلۡيَتِيمِ﴾ [الأنعام - ١٥٢] .

﴿وَلَا تَمۡشِ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَحًاۖ﴾ [لقمان - ١٨] .

وه نمونەی ئەم ئایەتانە زۆرن لە قورئاندا .

جا ئەمە ئەوانەن كە الله نەهی لێکردوون لە قورئاندا، وە الله پێمانی نەفەرمووە : مەڵێن : قورئان کەلامی منە .

وە فریشتەکانیش ناویان لە کەلامی الله ناوە کەلام، و ناویان نەناوە دروستکراو، وەکو فەرموویەتی : ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمۡ قَالُواْ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمۡۖ قَالُواْ ٱلۡحَقَّۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ﴾ [سورة سبأ - ٢٣] .

وە ئەمەش هۆکارەکەی ئەوەیە فریشتەکان گوێیان لە دەنگی وەحی نەبوو لە ماوەی نێوان عیسی و محمد علیهما السلام، وە نێوانیان ئەوەندە و ئەوەندە ساڵە بوو .

جا کاتێ الله تعالى وەحی بۆ پێغەمبەر محمد ﷺ نارد فریشتەکان گوێیان لە دەنگی وەحیەکە بوو وەک ئەوەی ئاسنێک بکەوێتە سەر بەردێکی لووس، فریشتەکان وا گومانیان برد کە ئەوە فەرمانێکە بۆ ڕۆژی دوایی، پاشان لە ترسان بە ڕووخساریان چوونە سوجدە بردن، جا ئەمە ئەو فەرمایشتەی الله تعالى یە کە فەرموویەتی : ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمۡ﴾ .

دەفەرمووێت : هەتاوەکو ترس لە دڵیاندا دەرکەوت، فریشتەکان سەریان بڵند کرد، هەندێکیان پرسیاریان لەویتریان کرد و وتیان : پەروەردگارتان چی فەرموو؟

نەیانوت : پەروەردگارمان چی درووست کرد .

جا ئەمە ڕوونكردنەوەیە بۆ كەسێك كە اللہ بیەوێت هیدایەتی بدات

.



# باب آخر (٦)



**٣١** - قال أحمد رضي الله عنه : ثم إن الجهمي ادَّعى أمرًا آخر، فقال: أنا أجد آيةً في كتاب الله تبارك وتعالى تدلُّ على أن القرآن مخلوق .

فقلنا: في أيِّ آية؟

فقال : قول الله تبارك وتعالى : ﴿مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ﴾ [الأنبياء : ٢] .

فزعم أن الله تعالى قال: إن القرآن مُحدث؛ وكل مُحدثِ مخلوق.

فلعمري لقد شبَّه على الناس بهذا، وهي آية من المتشابه، فقلنا في ذلك قولًا، واستعنا بالله، ونظرنا في كتاب الله، ولا حول ولا قوَّة إلَّا بالله .

فزعم أن الله تعالى قال: إن القرآن مُحدث؛ وكل محدث مخلوق .

فلعمري لقد شبَّه على الناس بهذا، وهي آية من المتشابه، فقلنا في ذلك قولا، واستعنا بالله، ونظرنا في كتاب الله، ولا حول ولا قوة إلابالله.

قال أحمد رضي الله عنه :

اعلم أن الشيئين إذا اجتمعا في اسم يجمعهما فكان أحدهما أعلى من الآخر، ثم جرى عليهما اسم مدح، فكان أعلاهما أولى بالمدح وأغلب عليه، وإن جرى عليهما اسم ذمِّ، أو اسم دنيء فأدناهما أولى به .

ومن ذلك قول الله تبارك وتعالى في كتابه : ﴿إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ [ الحج : ٦٥]، و﴿عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ اللَّهِ﴾ [الإنسان : ٦] .

فإذا اجتمعوا في اسم الإنسان، واسم العباد، فالمعنيُّ في قول الله تعالى: ﴿عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ اللَّهِ﴾ [الإنسان : ٦]؛ يعني: الأبرار دون الفجار، لقوله إذا انفرد الأبرار: ﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ﴾ [ الإنفطار : ١٣] .

وإذا انفرد الكفار: ﴿وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ﴾ [سورة الإنفطار : ١٤] .

وقوله : ﴿إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ [الحج : ٦٥]، فالمؤمن أولى به، وإن اجتمعا في اسم الناس؛ لأن المؤمن إذا انفرد أُعطي المدحة، لقوله : ﴿إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ [الحج : ٦٥] .

﴿وَكَانَ بِالْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا﴾ [الأحزاب : ٤٣] .

وإذا انفرد الكفار جرى عليهم اسم الذم في قوله : ﴿أَلَا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ﴾ [هود : ١٨] .

وقوله : ﴿أَن سَخِطَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَفِي الْعَذَابِ هُمْ خَالِدُونَ﴾ [المائدة: ٨٠]، فهؤلاء لا يدخلون في الرحمة.

وفي قوله : ﴿وَلَوْ بَسَطَ اللَّهُ الرِّزْقَ لِعِبَادِهِ لَبَغَوْا فِي الْأَرْضِ﴾ [الشورى : ٢٧] .

فاجتمع الكفار والمؤمنون في اسم العباد، فالكفار أولى بالبغي من المؤمنين؛ لأن المؤمنين انفردوا ومدحوا فيما بسط الله لهم من الرزق، وهو قوله تعالى : ﴿وَالَّذِينَ إِذَا أَنفَقُوا لَمْ يُسْرِفُوا وَلَمْ يَقْتُرُوا﴾ [الفرقان : ٦٧] .

وقوله : ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴾ [البقرة : ٣] .

وقد بسط الله الرزق لداود وسليمان بن داود عليهُما السَّلَام، ولذي القرنين، وأبي بكر وعمر وعثمان وعلي رضي الله عنهم، ومن كان على مثالهم ممن بسط الله له فلم يبغِ .

وإذا انفرد اسم الكافر وقع عليه اسم البغي في قوله لقارون : ﴿إِنَّ قَارُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ﴾ [القصص : ٧٦] .

ونمرود بن كنعان حين آتاه الله الملك فحاجَّ في ربه.

وفرعون حين قال موسى : ﴿رَبَّنَا إِنَّكَ آتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُ زِينَةً وَأَمْوَالًا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ [ يونس : ٨٨] .

فلما اجتمعوا في الاسم الواحد فجرى عليهم اسم البغي كان الكفار أولى به، كما أن المؤمن أولى بالمدحة.

فلما قال الله تعالى: ﴿مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ﴾ [الأنبياء: ٢].

فجمع بين ذكرين: (ذكر الله)، و(ذكر نبيّه)، فأما ذكر الله إذا انفرد لم يجرِ عليه اسم الحدث، ألم تسمع إلى قوله: ﴿وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ﴾ [العنكبوت: ٤٥]، ﴿وَهَٰذَا ذِكْرٌ مُّبَارَكٌ﴾ [الأنبياء: ٥٠].

وإذا انفرد ذكر النبي ﷺ فإنه جرى عليه اسم الحدث، ألم تسمع إلى قوله: ﴿وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ﴾ [الصافات: ٩٦].

فذكر النبي ﷺ له عمل والله له خالق ومحدث، والدلالة على أنه جمع بين ذكرين هو قوله: ﴿مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ﴾ [الأنبياء: ٢].

فأوقع عليه الحدث عند إتيانه إيانا، وأنت تعلم أنه لا يأتينا بالأنباء إلَّا مُبلِّغ ومُذكِّر، وقال الله: ﴿وَذَكِّرْ فَإِنَّ الذِّكْرَىٰ تَنفَعُ الْمُؤْمِنِينَ﴾ [الذاريات: ٥٥].

﴿فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ الذِّكْرَىٰ﴾ [الأعلى: ٩].

﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَا أَنتَ مُذَكِّرٌ﴾ [الغاشية: ٢١].

فلما اجتمعوا في اسم الذكر، جرى عليهم اسم الحدث، وكان النبي إذا انفرد وقع عليه اسم الخلق، وكان أولى بالحدث من ذكر الله الذي إذا انفرد لم يقع عليه اسم خلق ولا حدث.

فوجدنا دلالة من قول الله تبارك وتعالى: ﴿مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ﴾ [الأنبياء: ٢]، إنما هو محدث إلى النبي ﷺ؛ لأن النبي ﷺ كان لا يعلم فعلَّمه الله تعالى، فلما علَّمه الله تعالى كان ذلك محدثًا إلى النبي ﷺ.

# باب (٦)



٣١ - ئیمامی أحمد رحمه الله دەڵێت :

پاشان جەهمیەکە بانگەشەی شتێکی تری کرد، و وتی : من لە کتێبی الله تبارک و تعالى ئایەتێک دەدۆزمەوە کە دەلالەت لەوە بکات قورئان مەخلوقە .

وتمان : لە کام ئایەت؟

وتی : فەرمایشتی الله تبارک وتعالی کە فەرموویەتی : ﴿مَا يَأۡتِيهِم مِّن ذِكۡرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحۡدَثٍ﴾، [الأنبياء : ٢] .

واتە : هیچ یاد و بیرخستنەوەیەکیان بۆ نایەت لە لایەن پەروەردگاریانەوە کە تازە دابەزیوە .

جا پێی وایە الله تعالى فەرموویەتی : قورئان تازەیە، بۆیە هەموو تازەیەکیش مەخلوقە .

فَلَعَمري - پێشتر ڕوونکردنەوەمان داوە لەسەر ئەم دەستەواژەیە - بەمە شوبهەیان بۆ خەڵکی درووست کرد، وە ئەم ئایەتە یەکێکە لە ئایەتە متشابیهەکان - لێکچووەکان - ، جا لەمەدا قسەیەکمان کردووە، و پشتمان بە الله بەستووە، وە ڕوانیومانەتە کتێبی الله، ولا حول ولا قوة إلّا بالله .

ئیمامی أحمد رحمه الله دەڵێت :

بزانە گەر دوو شت کۆببنەوە لەناوێکدا ئەوا یەکێکیان بەرزتر دەبێت لەویتریان، پاشان ناوێکی مەدح بەسەریاندا تێپەڕێت، ئەوا ئەوەی کە بەرزترە و زاڵترە بەسەریدا لەپێشترە بۆ مەدح، وە گەر ناوێکی زەم بەسەریدا تێپەڕی یان ناوێکی پیس و ناشرین ئەوا نزمترینەکە بۆی لەپێشترە .

وە لەمەشدا قەولی الله تبارك وتعالى لە کتابەکەی : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ [الحج: ٦٥]، وە ﴿عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ ٱللَّهِ﴾ [الإنسان - ٦] .

ئەگەر لەناوی الإنسان و العباد کۆبکرێنەوە، مەبەست لە قەولی الله تعالى : ﴿عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ ٱللَّهِ﴾ واتە : چاکەکاران نەک خراپەکاران، بەهۆی فەرمایشتی الله تعالى کە چاکەکارانی بەتەنیا باسکردووە : ﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ﴾ [الانفطار: ١٣] .

وە کافرەکانیشی بەتەنیا باسکردووە : ﴿وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ﴾ [الانفطار: ١٤] .

وه قەولی الله تعالی : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ [الحج : ٦٥]، ئیمانداران لەپێشترن بۆی، ئەگەرچی لەناوی الناس - خەڵک - کۆی کردبێتەوە، چونکە ئیمانداران گەر بەتەنیا باسیان بکات مەدحیان پێ دەدات، کە فەرموویەتی : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ [الحج : ٦٥] .

﴿وَكَانَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَحِيمًا﴾ [الأحزاب - ٤٣] .

---

: مەبەستی ئەوەیە کەوا ئەگەرچی الله تعالی بە گشتی ئەفەرموێت : الله تعالی بۆ خەڵکی بەسۆز و میهرەبانە .

بەڵام ئیمانداران بۆ ئەو سۆز و میهرەبانیە لەپێشترن ئەگەرچی لەناوی (الناس . خەڵک) کۆیکردبێتەوە، بەڵکو بۆ ئیمانداران بە تایبەت باسی کردوون، والله اعلم .

وە کافرەکانی کە بە تەنیا باسکردووە و ناوی زەم بەسەریاندا ڕۆشتووە لە فەرمایشتی الله تعالی : ﴿أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ [هود - ١٨] .

وە فەرموویەتی : ﴿أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ وَفِي ٱلۡعَذَابِ هُمۡ خَٰلِدُونَ﴾ [المائدة - ٨٠]، ئەمانە ناچنە ژێر ڕەحمەتی الله تعالی .

وە لە قەولی الله تعالی : ﴿وَلَوۡ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزۡقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ [الشوری - ٢٧] .

كافرەکانی و ئیمانداارانی لەناوی (العباد . بەندەکان) کۆکردووتەوە، کافرەکان لەپێشترن بۆ ئەنجامدانی زوڵم و ستەم وەک لە ئیمانداران، لەبەرئەوەی الله تعالى ئیمانداارانی جیاکردۆتەوە و بەتەنیا باسی کردوون کە رزق و ڕۆزیان پێ دەبەخشێت، کە ئەوە فەرمایشتی الله تعالى یە : ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمۡ يُسۡرِفُواْ وَلَمۡ يَقۡتُرُواْ﴾ [الفرقان - ٦٧] .

وە فەرموویەتی : ﴿وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ﴾ [البقرة - ٣] .

---

: مەبەستی ئەوەیە کە الله تعالى ئیمانداارانی بەتەنیا باسکردووە لەوکاتەی کە رزق و ڕۆزیان پێ دەبەخشرێت ئەوا زیادەڕۆیی تێدا ناکەن و بە کەسانی تریش دەیبەخشن .

هەروەها الله تعالى بە لێشاو و بە فراوانی ڕزقی دا بە داود و سلیمان بن داود علیهما السلام، وە بە ذي القرنين، و أبي بكر و عمر و عثمان و علي رضي الله عنهم، وە ئەوانەش کە نموونەی ئەمانە بوون کە الله ڕزقی پێ بەخشین زوڵمیشیان نەکرد .

وە ئەگەر ناوی کافرەکانی بە تەنیا باسکردبێت ئەوا ناوی زوڵمی کەوتووەتە سەر هەروەکو لە فەرمایشتی الله تعالى بۆ قارون هاتووە کە فەرموویەتی : ﴿إِنَّ قَٰرُونَ كَانَ مِن قَوۡمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيۡهِمۡۖ﴾ [القصص - ٧٦] .

وه نەمرود بن کنعان کاتێ الله تعالی موڵکی پێ بەخشی خۆی بێ موجادەلەی دەکرد دەربارەی پەروەردگاری - واتە ڕەتی دەکردەوە ئیمانی پێ بهێنێ بۆیە موجادەلەی دەکرد لەگەڵ پێغەمبەر ابراهیم علیه السلام - .

وه فیرعەون کاتێ موسی علیه السلام فەرمووی: ﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ ءَاتَيۡتَ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَأَهُۥ زِينَةً وَأَمۡوَ ٰلًا فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ [یونس - ٨٨] .

جا کە هەردووکیان لەناوێکدا کۆبوونەوە و ناوی زوڵم بەسەریدا تێپەڕیبوو ئەوا کافرەکان بۆ ئەو زوڵمە لەپێشترن، هەروەکو چۆن ئیمانداران لەپێشترن بۆ مەدح کردن .

ئینجا کە الله تعالی فەموویەتی: ﴿مَا يَأۡتِيهِم مِّن ذِكۡرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحۡدَثٍ﴾، [الأنبياء: ٢] .

ناوی دوو بیرخستنەوەی تێدا کۆکردووتەوە: (بیرخستنەوەی الله) وە (بیرخستنەوەی پێغەمبەرەکەی)، ئەمما یاد و بیرخستنەوەی الله ئەگەر بە تەنیا باس کرابێت ئەوا ناوی (الحدث. تازە) ی بەسەردا نەهاتووە، ئایا گوێت لە فەرمایشتی الله نەبووە کە فەموویەتی: ﴿وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُ﴾ [العنكبوت - ٤٥]، وە ﴿وَهَٰذَا ذِكۡرٌ مُّبَارَكٌ﴾ [الأنبياء - ٥٠] .

وه ئەگەر یاد و بیرخستنەوەی پێغەمبەر ﷺ بەتەنیا باسکرابێت ئەوا ناوی (الحدث.تازە)ی بەسەردا هاتووە، ئایا گوێت لە فەرمایشتی الله نەبووە کە فەرموویەتی : ﴿وَٱللَّهُ خَلَقَكُمۡ وَمَا تَعۡمَلُونَ﴾ [الصافات - ٩٦] .

الله تعالی باسی کردووە کە پێغەمبەر ﷺ کردەوەی هەیە، وە الله درووستکاریەتی داهێنەریەتی، وە بەڵگە بۆ ئەوەی کەوا الله تعالی هەردوو یادخستنەوەکەی کۆکردووەتەوە ئەوەیە کە فەرموویەتی : ﴿مَا يَأۡتِيهِم مِّن ذِكۡرٖ مِّن رَّبِّهِم مُّحۡدَثٍ﴾، [الأنبياء : ٢] .

جا تازەیی ئەو کاتە چووەتە سەری کە هاتووەتە لای ئێمە - واتە بۆ ئێمە تازەیە نەک بۆ الله چونکە ئێمە بێ ئاگا بووین پێش هاتنی یاد و بیرخستنەوە بەڵام الله لە ئەزەلەوە زانستی پێی هەبووە - ، وە تۆش دەزانیت کە نایەتە لامان بە هەواڵەوە ئیللا وەکو ڕاگەیەنەر و یاد خەرەوە نەبێ، وەکو الله تعالی دەفەرموێت : ﴿وَذَكِّرۡ فَإِنَّ ٱلذِّكۡرَىٰ تَنفَعُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ [الذاریات - ٥٥] .

وە ﴿فَذَكِّرۡ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكۡرَىٰ﴾ [الأعلى - ٩] .

﴿فَذَكِّرۡ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٞ﴾ [الغاشية - ٢١] .

جا کاتێ لە ناوی یاد (الذکر) کۆبوونەتەوە، ئەوا ناوی تازە (الحدث) بەسەریدا تێدەپەڕێ، وە کاتێ پێغەمبەر ﷺ بە تەنیا باسکرابێت ئەوا ناوی درووستکراو (خلق) بەسەریدا دێت، وە پێغەمبەر لە پێشترە بەو تازەیە وەک

لە یاد و بیرخستنەوەی الله - کە قورئانە - کە گەر بە تەنیا باسکرابێت ئەوا ناوی درووستکراو و تازە لەگەڵیدا نایەت .

جا بەڵگەیەکمان دۆزیەوە لە فەرمایشتی الله تبارک وتعالی کە فەرموویەتی : ﴿مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ﴾، [الأنبياء : ٢]، ئا ئەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ تازەیە، چونکە پێغەمبەر ﷺ نەیدەزانی جا الله تعالی فێری کرد، وە کاتێ الله تعالی فێری کرد تازە بوو بۆ پێغەمبەر ﷺ .



# باب (٧)



**٣٢** - ثم إن الجهمي ادَّعى أمرًا آخر، فقال: أنا أجد آيةً في كتاب الله تدلُّ على أن القرآن مخلوق.

فقلنا: أيَّ آيةٍ؟

فقال: قول الله: ﴿إِنَّمَا الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ اللَّهِ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَىٰ مَرْيَمَ﴾ [النساء: ١٧١]، وعيسى مخلوق.

فقلنا له: إن الله منعك الفهم في القرآن، عيسى تجري عليه ألفاظ لا تجري على القرآن؛ لأنه يجري عليه تسمية: مولود، وطفل، وصبيّ وغلام، يأكل ويشرب، وهو مُخاطب بالأمر والنهي، يجري عليه اسم الخطاب والوعد والوعيد.

ثم هو من ذُرِّيَّة إبراهيم، فلا يحلُّ لنا أن نقول في القرآن ما نقول في عيسى، فهل سمعتم الله يقول في القرآن ما قال في عيسى؟!

ولكن المعنى في قول الله جل ثناؤه: ﴿إِنَّمَا الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ اللَّهِ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَىٰ مَرْيَمَ﴾ [النساء: ١٧١].

فالكلمة التي ألقاها إلى مريم حين قال له: (كن)، فكان عيسى : بـ(كن) وليس عيسى هو (الكُنْ)، ولَكِنْ (بالكُنْ) كان، (فالكُنْ) من الله قول، وليس (الكن) مخلوقاَ.

وكذبت النصارى والجهمية على الله في أمرِ عيسى؛ وذلك أن الجهمية قالوا: عيسى روح الله وكلمته، إلَّا أن كلمته مخلوقة.

وقالت النصارى : عيسى روح الله من ذات الله، وكلمته من ذات الله، كما يقال : إن هذه الخرقة من هذا الثوب.

وقلنا نحن : إن عيسى بالكلمة كان، وليس عيسى هو الكلمة.

وأما قول الله: ﴿وَرُوحٌ مِّنْهُ﴾ [سورة النساء: ١٧١]، يقول : من أمره كان الروح فيه، كقوله: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ﴾ [الجاثية: ١٣]، يقول : من أمره.

وتفسير (روح الله) إنما معناها : أنها روحٌ بكلمة الله خلقها الله، كما يقال: عبد الله، وسماء الله، وأرض الله .

# باب (٧)



**٣٢** - پاشان جەهمیەکە بانگەشەی شتێکی تری کرد، وتی : من لە قورئاندا ئایەتێک دەدۆزمەوە کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە قورئان مەخلوقە .

وتمان : کامە ئایەت؟

وتی : فەرمایشتی الله کە فەرموویەتی : ﴿إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ﴾ [النساء - ١٧١]، وە عیسى مەخلوقە .

پێمان وت : الله ڕێگری کردووە لێت کە لە قورئان تێبگەیت، بەسەر عیسى علیه السلام کۆمەڵە دەربڕینێک دەڕوات کە بەسەر قورئاندا ناڕوات، چونکە بەسەر - عیسى علیه السلام - ناوی : لە دایک بوون، و منداڵ، و مێرد منداڵ و لاو، دەخوات و دەخواتەوە دێت، وە عیسى علیه السلام قسە دەکات بە فەرمان کردن و ڕێگری کردن، بەسەر عیسى علیه السلام ناوی قسەکەر و بەڵێن و هەڕەشە دێت .

پاشان ئەو لە نەوەکانی إبراهیم علیه السلام ە، بۆیە درووست نییە بۆمان دەربارەی قورئان ئەوە بڵێین کە دەربارەی عیسی علیه السلام دەیڵێین، جا ئایا بیستوتانە الله هەمان ئەوە بڵێت دەربارەی قورئان کە دەربارەی عیسی فەرموویەتی؟

بەڵام مانای فەرمایشتی الله جلَّ ثناؤه : ﴿إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ﴾ [النساء - ١٧١] .

جا ئەو وشەیەی کە ناردی بۆ مریم کاتێک پێی فەرموو : (كُن)، ئەوکات عیسی بە (كُن) دروست بوو وە عیسی (كُن) ەکە نییە، بەڵام بەو (كُن) ە دروست بوو، جا (كُن) ەکە لە الله وەیە و وتەیەکە، و (كُن) مەخلوق نییە - واتە الله فەرمانی پێ کردووە ببێت و ئیتر بووە، نەک خودی فەرمانەکە عیسی علیه السلام بێت، بەڵکو بەو فەرمانەی الله دروست بووە، والله اعلم - .

وە نەصارا و جەهمیەکان درۆیان بۆ الله هەڵبەست دەربارەی عیسی علیه السلام، ئەوەبوو جەهمیەکان وتیان : عیسی ڕوح و کەلیمەی الله یە، بۆیە کەلیمەی الله ش مەخلوقە .

وە نەصاراش وتیان : عیسی ڕوحی الله یە و لە زاتی الله یە، وە کەلیمەی الله لە زاتی الله یە، هەروەکو دەوترێ : ئەو پارچە قوماشە لەم جلەیە .

وە ئێمەش وتمان : عیسى علیه السلام بە کەلیمەی الله دروست بووە، نەک عیسى خۆی کەلیمەکە بێت .

وە فەرمایشتی الله تعالى : ﴿وَرُوحٌ مِّنۡهُۖ﴾ [النساء : ١٧١]، دەفەرمووێت : لە فەرمانی ئەوەوە ڕووحی تێچوو، وەک دەفەرمووێت : ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُۚ﴾ [الجاثية - ١٣]

دەفەرمووێت : لە فەرمانەکانی ئەوەوە .

وە تەفسیری (روح الله) مانای ئەوەیە : کە ئەو ڕوحێکە بە کەلیمەی الله و الله درووستی کردووە، هەروەکو دەوترێ : بەندەی الله، ئاسمانی الله، زەوی الله .



# باب (٨)



**٣٣** - ثم إن الجهمي ادَّعى أمرًا آخر، فقال: إن الله يقول: ﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ [السجدة: ٤].

فزعم أن القرآن لا يخلو أن يكون في السمٰوات، أو في الأرض، أو فيما بينهما، فشبَّه على الناس، ولبَّس عليهم.

فقلنا لهم: أليس إنما أوقع الله عَزَّ وَجَلّ الخلق والمخلوق على ما في السمٰوات، وما في الأرض، وما بينهما؟

فقالوا: نعم.

فقلنا: هل فوق السمٰوات شيءٌ مخلوق؟

قالوا: نعم.

فقلنا: فإنه لم يجعل ما فوق السمٰوات من الأشياء المخلوقة، وقد عرف أهل العلم أن فوق السمٰوات السبع: الكرسي، والعرش، واللوح المحفوظ،

والحجب، وأشياء كثيرة ولم يُسمِّها، ولم يجعلها مع الأشياء المخلوقة، وإنما وقع الخبر من الله على السمٰوات والأرض وما بينهما.

وقلنا فيما ادَّعوا أن القرآن لا يخلو أن يكون في السمٰوات، أو في الأرض، أو فيما بينهما.

فقلنا : إن الله تبارك وتعالى يقول: ﴿مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ﴾ [الروم - ٨] .

فالذي خلق به السمٰوات والأرض قد كان قبل خلق السمٰوات والأرض.

و(الحق) الذي خلق به السمٰوات والأرض هو (قوله)؛ لأن الله تعالى يقول (الحق)، قال: ﴿ وَالْحَقَّ أَقُولُ﴾ [ص : ٨٤] .

﴿وَيَوْمَ يَقُولُ كُن فَيَكُونُ قَوْلُهُ الْحَقُّ﴾ [الأنعام : ٧٣] .

فالحقُّ الذي خلق به السمٰوات والأرض قد كان قبل السمٰوات والأرض، والحق قوله، وليس قوله مخلوقًا .

# باب (٨)



**٣٣** - پاشان جەهمیەکە بانگەشەی شتێکی تری کرد، وتی : اللّٰه دەفەرمووێت : ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ [السجدة - ٤] .

جا پێی وایە کە قورئان خاڵی نییە لەوەی کە لە ئاسمانەکاندا بێت، یان لە زەوی، یان لە نێوانیان، بەمەش شوبهەی بۆ خەڵکی درووست کرد، و چەواشەی خەڵکی کرد .

جا پێمان وتن : ئایا اللّٰه عزَّوَجَل دەستەواژەی درووستکردن و دروستکراوی نەخستووەتە سەر ئەوەی لە ئاسمانەکان، و زەوی، ئەوەشی لە نێوانیان هەیە؟

وتیان : بەڵێ .

پاشان وتمان : ئایا لە سەرووی ئاسمانەکان شتێکی مەخلوق هەیە؟

وتیان : بەڵێ .

بۆیە وتمان : جا الله ئەو شتانەی سەرووی ئاسمانەکانی بە شتانێکی درووستکراو هەژمار نەکردووە، کەچی ئەهلی عیلم زانیویانە کەوا لەسەرووی حەوت ئاسمانەکان : کورسی، و عەرش، و اللوح المحفوظ، و پەردە، وە شتانێکی زۆر کە ناویانی نەهێناوە، وە لەگەڵ شتە مەخلوقەکان هەژماریانی نەکردووە، بەڵکو هەواڵێکە لەلایەن الله ەوە کەوتووەتە سەر ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیان دایە - واتە ڕاستە شتەکان دروستکراون بەڵام لە ئایەتەکەی سەرەوە تەنیا باسی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیانی کردووە - .

وە دەربارەی ئەوەی بانگەشەیان بۆ کرد کە وتبویان : قورئان خاڵی نییە لە ئاسمانەکان، و زەوی، و نێوانیان دابێت.

وتمان : الله تبارک وتعالى دەفەرمووێت : ﴿مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ﴾ [الروم - ٨] .

جا ئەو شتەی کە ئاسمانەکان و زەوی درووست کردووە پێش درووست بوونی ئاسمانەکان و زەوی هەبووە - واتە الله تعالى پێش ئەوەی زەوی و ئاسمانەکان درووست بکات کەلام و فەرمانی خۆی هەر هەبووە - .

وە (الحق) ئەوەیە کە ئاسمانەکان و زەوی پێ دروست کردووە کە وتەی الله یە، چونکە الله تعالى حەق دەڵێت، فەرموویەتی : ﴿وَٱلۡحَقَّ أَقُولُ﴾ [ص - ٨٤] .

﴿وَيَوۡمَ يَقُولُ كُن فَيَكُونُۚ قَوۡلُهُ ٱلۡحَقُّۚ﴾ [الأنعام - ٧٣] .

جا ئەو حەق ەی کە اللّٰه تعالی ئاسمانەکان و زەوی پێ درووست کردووە لە پێش ئاسمانەکان و زەوی هەبووە، وە حەق وتەی اللّٰه تعالی یە، وە وتەی اللّٰه تعالی مەخلوق نییە .



# باب (٩)

## بيان ما جحدت به الجهمية من قول الله سبحانه : ﴿وُجُوهٌ يَوۡمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ (٢٢) إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ (٢٣)﴾ [القيامة]



**٣٤** - قال أحمد رحمه الله :

فقلنا لهم : لم أنكرتم أن أهل الجنة ينظرون إلى ربهم؟

قالوا : لا ينبغي لأحدٍ أن ينظر إلى الله؛ لأن المنظور إليه معلوم موصوف، لا يرى إلَّا شيء يفعله.

فقلنا : أليس الله يقول : ﴿إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ (٢٣)﴾؟

فقالوا : إنما معنى : ﴿إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ (٢٣)﴾، أنها تنتظر الثواب من ربها، وإنما ينظرون إلى فعله وقُدرته.

وتلوا آيةً من القرآن : ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ﴾ [الفرقان : ٤٥] .

فقالوا : إنه حين قال : ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ﴾، أنهم لم يروا ربهم؛ ولكن المعنى: ألم ترَ إلى فعل ربك؟

فقلنا لهم: إن فعل الله لم يزل العباد يرونه، وإنما قال: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ (٢٢) إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ (٢٣)﴾ [القيامة] .

فقالوا : إنما تنتظر الثواب من ربها.

فقلنا لهم : إنها مع ما تنتظر الثواب من ربها هي ترى ربها.

فقالوا : إن الله لا يُرى في الدنيا ولا في الآخرة.

وتلوا آيةَ من المتشابه من قول الله جلَّ ثناؤه: ﴿لَّا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الْأَبْصَارَ﴾ [سورة الأنعام: ١٠٣] .

فقلنا : أخبرونا عن النبي ﷺ حين قال: (إنكم سترون ربكم كما ترون القمر)، أليس النبي ﷺ قد كان يعرف معنى قول الله: ﴿لَّا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ﴾ [سورة الأنعام: ١٠٣] .

وقال : (إنكم سترون ربكم) .

وقال لموسى : ﴿لَن تَرَانِي﴾ [الأعراف: ١٤٣]، ولم يقل : لن أُرى.

فأيهما أولى أن نتبع النبي حين قال : (إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ).

أو قول الجهمي حين قال: لا ترون ربكم؟!

والأحاديث في أيدي أهل العلم عن النبي ﷺ أن أهل الجنة يرون ربهم؛ لا يختلف فيها أهل العلم.

ومن حديث سفيان، عن أبي إسحاق، عن عامر بن سعد رضي الله عنه في قول الله: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ﴾ [يونس: ٢٦]، قال: النظر إلى وجه الله.

ومن حديث ثابت البُناني، عن عبد الرحمٰن بن أبي ليلى، عن صُهيب رضي الله عنه، عن النبي ﷺ قال: (إذا استقرَّ أهل الجنة في الجنة، ونادى منادٍ: يا أهل الجنة، إن الله قد أذن لكم في الزيادة، قال: فيكشف الحجاب، فيتجلَّى لهم، فما أعطاهم شيئًا كان أحبَّ إليهم من النظر إليه).

قال الإمام أحمد رحمه الله:

وإنا لنرجو أن يكون الجهم وشيعته ممن لا ينظرون إلى ربهم، ويحجبون عن الله تعالى؛ لأن الله قال للكفار: ﴿كَلَّا إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ﴾ [المطففين: ١٥]، فإذا كان الكافر يُحجب عن الله، والمؤمن يُحجب عن الله، فما فضل المؤمن على الكافر؟!

والحمد لله الذي لم يجعلنا مثل جهم وشيعته، وجعلنا ممن اتبع، ولم يجعلنا ممن ابتدع، والحمد لله وحده.

# باب (٩)

## ڕوونكردنەوە دەربارەی ئەوەی كە جەهمیەكان نكۆڵی لێدەكەن لە فەرمایشتی الله سبحانه و تعالی دەكەن كە فەرموویەتی : ﴿وُجُوهٌ يَوۡمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ (٢٢) إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ (٢٣)﴾ [القيامة]



**٣٤** - ئیمامی أحمد رحمه الله دەڵێت :

پێمان وتن : بۆچی ئینكاری ئەوەتان كرد كە ئەهلی بەهەشت سەیری پەروەردگاریان بكەن؟

وتیان : بۆ هیچ كەسێك ناكرێ كە سەیری الله بكات، لەبەر ئەوەی سەیركراو - كە الله یە - زانراوە و وەسفكراوە، هیچ نابینرێت تەنها ئەوە نەبێت كە - الله - ئەنجامی ئەدات و دەیكات - جەهمیەكان پێیان وایە هیچ نابینرێت بەڵكو ئەوە ئەبینرێت كە كردوویەتی - .

وتمان : ئەی الله نافەرمووێت : ﴿إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾؟

وتیان : مانای : ﴿إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾، ئەوەیە کە ئەوان چاوەڕوانی پاداشت دەکەن لە پەروەردگاریان، وە بەندەکانیش سەیری کار و دەسەڵاتی الله دەکەن .

وە ئایەتێکیان خوێندەوە لە قورئان : ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ ٱلظِّلَّ﴾ [الفرقان - ٤٥] .

جا وتیان : ئەوە کاتێ فەرمووی : ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ﴾، کە بەندەکان پەروەدگاریان نەدیبوو، جا مانای ئەوەنیە کە : ئایە کاری پەروەدگارت نەبینی؟

پێمان وتن : بەڕاستی کاری الله تعالی بە بەردەوامی بەندەکان دەیبینن - واتە لە دونیاشدا بەندەکان کارەکانی الله دەبینن جا کەواتە چ مانایەک دەدا کە الله لەم ئایەتە مەبەستی ئەوەبێ لە ئاخیرەتدا کارەکانی ببینن - ، بەڵکو فەرموویەتی : ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ (٢٢) إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ (٢٣)﴾ [القيامة] .

وتیان : ئەوان چاوەڕێی پاداشت دەکەن لە پەروەردگاریان .

پێمان وتن : ئەوان لەگەڵ ئەوەی چاوەڕێی پاداشت دەکەن لە پەروەردگاریان ئەوا پەروەردگاریشیان دەبینن .

وتیان : الله نابینرێت لە دونیا و ئاخیرەتدا .

وە ئایەتێکیان خوێندەوە کە لە متشابیهەکان بوو لە فەرمایشتی الله جلَّ ثناؤە : ﴿لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَهُوَ يُدۡرِكُ ٱلۡأَبۡصَٰرَۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ﴾ [الأنعام - ١٠٣].

وتمان : پێمان ڕابگەیەنن سەبارەت بە پێغەمبەر ﷺ کاتێ فەرمووی : (بەڕاستی ئێوە پەروەردگارتان دەبینن هەروەکو چۆن مانگ دەبینن)، ئایا پێغەمبەر ﷺ مانای فەرمایشتی الله ی نەدەزانی کە دەفەرموێت : ﴿لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ﴾ .

وە فەرمووی : (بەڕاستی ئێوە پەروەدگارتان دەبینن) .

وە الله بە موسی علیه السلام ی فەرموو : ﴿لَن تَرَىٰنِي﴾ [الأعراف. ١٤٣]، نەیفەرمووە : نابینرێم .

جا کامیان لە پێشترە کە شوێنی بکەوین : پێغەمبەر ﷺ کاتێ فەرمووی : (بەڕاستی ئێوە پەروەدگارتان دەبینن) .

یان جەهمیەکان کاتێ دەڵێن : پەروەردگارتان نابینن؟!

وە ئەو فەرموودانەی لە بەر دەستی ئەهلی عیلمن لە پێغەمبەر ەوە ﷺ کە ئەهلی بەهەشت پەروەردگاریان دەبینن، ئەهلی عیلم هیچ خیلافێکیان تیایاندا نییە .

وە لە فەرموودەی سفیان، لە أبي إسحاق، لە عامر بن سعد رضي الله عنه دەربارەی فەرمایشتی الله تعالی : ﴿لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ ٱلۡحُسۡنَىٰ وَزِيَادَةٞۖ﴾ [یونس - ٢٦] .

دەڵێت : سەیرکردنی ڕووخساری الله یە .

وە لە فەرموودەی ثابت البناني، لە عبدالرحمن بن أبي لیلی، لە صهیب رضي الله عنه، لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی : (کاتێ ئەهلی بەهەشت لە بەهەشت جێگیر بوون، و بانگدەرێک بانگی کرد : ئەی ئەهلی بەهەشت، الله ڕووخسەتی دان لەو زیادەیە : فەرمووی : جا الله پەردە لادەبات و بە شکۆوە خۆی پێیان نیشان دەدات، جا هیچ شتێکی پێیان نەداوە لە لایان خۆشەویستتر بێ لە بینینی الله) .

ئیمامی أحمد رحمه الله دەڵێت :

وە ئێمە ئومێدمان وایە جەهم و لایەنگرانی لەوانە بن کە سەیری پەروەردگاریان ناکەن، و پەردە دەدرێت بەسەر چاویان تاوەکو الله تعالی نەبینن، چونکە الله تعالی بە کافرەکانی فەرمووە : ﴿كَلَّآ إِنَّهُمۡ عَن رَّبِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ لَّمَحۡجُوبُونَ﴾ [المطففین - ١٥] .

جا ئەگەر کافر پەردە بدرێت بەسەر چاویان تا الله نەبینن، وە ئیمانداران پەردە بدرێت بەسەر چاویان تا الله نەبینن، کەواتە فەزڵی ئیمانداران بەسەر کافران چییە؟

الحمد لله كه وەک جەهم و لایەنگرانی لێنەکردووین، وە ئێمەی کردووە بەوانەی شوێن دەکەون، وە نەیکردوین بەوانەی کە بیدعە دەکەن، والحمد لله وحده.



# باب (١٠)

## بيان ما أنكرت الجهمية من أن يكون الله كلم موسى



**٣٥** - قال أحمد رحمه الله :

فقلنا : لِمَ أنكرتم ذلك؟

فقالوا : إن الله لم يتكلم ولا يتكلم، إنما كوَّن شيئًا فعبَّر عن الله، وخلق صوتًا فأسمع، وزعموا أن الكلام لا يكون إلَّا من جوفٍ ولسان وشفتين.

فقلنا لهم : فهل يجوز لمكوَّنٍ أو غير الله أن يقول : ﴿يَٰمُوسَىٰٓ (١١) إِنِّيٓ أَنَا۠ رَبُّكَ فَٱخۡلَعۡ نَعۡلَيۡكَ إِنَّكَ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوٗى (١٢)﴾ [طه].

أو يقول : ﴿إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ﴾ [طه - ١٤]، فمن زعم ذلك فقد أن غير الله ادَّعى الربوبية.

ولو كان - كما زعم الجهمي - أن الله كوَّن شيئًا كان يقول ذلك المكوَّن: يا موسى إني لست أنا الله ربَّ العالمين، ولا يجوز له أن يقول : ﴿يَٰمُوسَىٰ إِنِّي أَنَا اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾ [القصص - ٣٠] .

وقد قال الله تعالى : ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمًا﴾ [النساء - ١٦٤] .

وقال : ﴿وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ﴾ [الأعراف - ١٤٣] .

وقال : ﴿إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِي وَبِكَلَٰمِي﴾ [الأعراف - ١٤٤] .

فهذا منصوص القرآن .

فأما ما قالوا : إن الله لم يتكلم ولا يتكلم، فكيف يصنعون بحديث الأعمش، عن خيثمة، عن عدي بن حاتم الطائي رضي الله عنه، قال : قال النبي ﷺ : (ما منكم من احدٍ إلَّا سيكلِّمه الله ليس بينه وبينه تُرجمان)؟

وأما قولهم : إن الكلام لا يكون إلَّا من جوفٍ، وفم، وشفتين، ولسان، أليس الله للسمٰوات والأرض : ﴿ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهًا قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ﴾ [فصلت - ١١] .

تراها أنها قالت بجوفٍ، وفمٍ، وشفتين، ولسان، وأدوات؟!

وقال : ﴿وَسَخَّرۡنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلۡجِبَالَ يُسَبِّحۡنَ وَٱلطَّيۡرَ وَكُنَّا فَٰعِلِينَ﴾ [الأنبياء - ٧٩] .

أتراها أنها يسبحن بجوفٍ، وفمٍ، ولسانٍ، وشفتين؟!

والجوارح إذ شهدت على الكفار، فقالوا : ﴿لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَاۖقَالُوا أَنطَقَنَا اللَّهُ الَّذِي أَنطَقَ كُلَّ شَيْءٍ﴾ [فصلت : ٢١] .

أتراها أنها نطقت بجوفٍ، وفمٍ، ولسانٍ؟!

ولكن الله أنطقها كيف شاء .

وكذلك الله تكلم كيف شاء من غير أن يقول: بجوفٍ، ولا فمٍ، ولا شفتين، ولا لسان .

# باب (١٠)

## دەرخستنی ئەوەی جەهمیەکان ئینکاریان لێ کرد لەوەی کە الله قسەی لەگەڵ موسی علیه السلام کردبێ



**٣٥** - ئیمامی أحمد رحمه الله دەڵێت :

وتمان : بۆچی ئینکاریتان لەوە کرد؟

وتیان : الله قسەی نەکردووە و ناشی کات، بەڵکو شتێکی درووست کردووە و پاشان تەعبیری لە الله کردووە، وە دەنگێکی درووستکردووە پاشان وای کرد بیبیستێ، وە پێیان وایە کە قسەکردن ڕوونادات ئیللا بە ناخێک و زمانێک و دوو لێو نەبێت .

بۆیە پێمان وتن : ئایا دەکرێت درووست کراوێک یان غەیری الله بڵێت : ﴿يَٰمُوسَىٰٓ (١١) إِنِّيٓ أَنَا۠ رَبُّكَ فَٱخۡلَعۡ نَعۡلَيۡكَ إِنَّكَ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوٗى (١٢)﴾ [طه] .

یان دەفەرمووێت : ﴿إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ﴾ [طه - ١٤].

هەر کەسێک ئەوە بیروباوەڕی بێت ئەوا پێی وایە کە غەیری الله بانگەشەی پەروەردگارێتی کردووە - واتە پێی وایە لە غەیری الله کەسێکی تر هەیە کە زەوی و ئاسمانەکانی دروست کردووە و ڕزقدەر و ڕۆزیدەر و ... هتد - .

خۆ ئەگەر بەو شێوەیە بێ کە جەهمیەکە پێی وایە کەوا الله شتێکی دروست کردووە ئەوا ئەو شتە دروستکراوە دەیوت : ئەی موسى من پەروەردگاری جیهانیان نیم، وە بۆی نەبوو بڵێت : ﴿يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّيٓ أَنَا ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ [القصص - ٣٠].

لە کاتێکدا الله تعالى فەرموویەتی : ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا﴾ [النساء - ١٦٤].

وە فەرموویەتی : ﴿وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ﴾ [الأعراف - ١٤٣].

وە فەرموویەتی : ﴿إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِي وَبِكَلَٰمِي﴾ [الأعراف - ١٤٤].

جا ئەمانە دەقەکانی قورئانن .

ئەوەش کە وتیان : الله قسەی نەکردووە و ناشی کات، ئەوا چی لە فەرموودەی ئەعمەش دەکەن، لە خیثمة، لە عدي بن حاتم الطائي رضي الله

عنه، فەرمووی : پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : (هیچ کامێک لە ئێوە نییە ئیللا اللە قسەی لەگەڵدا دەکات وە هیچ وەرگێڕێک لەنێوانیاندا نییە)؟ - البخاري (٦٥٣٩) - مسلم (١٠١٦) - .

وە هەروەها ئەو قسەیەیان کە دەڵێن : قسەکردن ڕوونادات ئیللا بە ناخێک و دەمێک و دوو لێو نەبێت، مەگەر اللە بە و ئاسمانەکان و زەوی نەفەرمووە : ﴿ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهًا قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ﴾ [فصلت - ١١] .

ئایا وای دەبینن کە وتبێتیان بە ناخێک و دەمێک و دوو لێو و زمانێک و ئەدەواتی تر؟! - واللە اعلم، واتە کە ئاسمانەکان و زەوی وەڵامی اللە یان دایەوە، پێتان وایە بە دەم و زمان و دوو لێو قسەیان کردبێ و وەڵامیان دابێتەوە؟ - .

وە فەرموویەتی : ﴿وَسَخَّرۡنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلۡجِبَالَ يُسَبِّحۡنَ وَٱلطَّيۡرَۚ وَكُنَّا فَٰعِلِينَ﴾ [الأنبياء - ٧٩] .

ئایا وای دەبینن ناخێک و دەمێک و دوو لێو و زمانێک و تەسبیحات بکەن؟!

وە ئەندامەکان کاتێ شاهێدی بەسەر کافرەکانەوە دەدەن، دەڵێن : ﴿لِمَ شَهِدتُّمۡ عَلَيۡنَاۖ قَالُوٓاْ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنطَقَ كُلَّ شَيۡءٖ﴾ [فصلت - ٢١] .

ئایا وای دەبینن کە اللە ئەندامەکانی لاشەی هێنابێتە قسە بە ناخێک و دەمێک و زمانێک؟!

بەڵكو الله دەيان هێنێتە قسە هەر چۆنێک کە ويستى لێ بووبێت .

وە بە هەمان شێوە الله تعالى قسەی کردووە هەر چۆنێک کە ويستى لێ بووبێت بۆ ئەوەی بڵێی : بە ناخێک، وە نە بە دەم و دوو لێو و زمانێک .



**٣٦** - قال أحمد رضي الله عنه :

فلما خنقته الحُجج، قال : إن الله كلَّم موسى إلَّا أن كلامه غيره.

فقلنا : وغيره مخلوق؟

قال: نعم.

فقلنا : هذا مثل قولكم الأول، إلَّا أنكم تدفعون عن أنفسكم الشُّنعة بما تُظهرون.

وحديث الزهري، قال: لما سمع موسى كلام ربه، قال : يا رب، هذا الذي سمعته هو كلامك؟

قال : نعم يا موسى هو كلامي وإنما كلمتك بقوةِ عشرة آلاف لسان، ولي قوة الألسن كلها، وأنا أقوى من ذلك، وإنما كلمتك على قدر ما يطيق بدنك، ولو كلمتك بأكثر من ذلك لَمِتَّ.

قال : فلما رجع موسى إلى قومه قالوا له: صف لنا كلام ربك.

فقال : سبحان الله، وهل أستطيع أن أصفه لكم؟!

قالوا : فشبِّهه.

قال : هل سمعتم أصوات الصواعق التي تقبل في أحلا حلاوة سمعتموها، فكأنه مثله.

وقلنا للجهمية : من القائل لعيسى يوم القيامة : ﴿يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ءَأَنتَ قُلۡتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيۡنِ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ﴾ [المائدة - ١١٦].

أليس الله هو القائل؟

قالوا : يُكوِّن الله شيئًا فيُعَبِّر عن الله، كما كوَّن شيئًا فعَبَّر لموسى.

فقلنا : فمن القائل: ﴿فَلَنَسۡـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرۡسِلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَنَسۡـَٔلَنَّ ٱلۡمُرۡسَلِينَ (٦) فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيۡهِم بِعِلۡمٖۖ وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ (٧)﴾ [الأعراف].

أليس الله هو الذي يسأل؟

قالوا : هذا كله إنما يُكوِّن شيئًا، فيعبِّر عن الله.

فقلنا : قد أعظمتم على الله الفرية حين زعمتم أنه لا يتكلم فشبهتموه بالأصنام التي تعبد من دون الله، لأن الأصنام لا تتكلم، ولا تنطق، ولا تتحرك، ولا تزول من مكان إلى مكان.

فلما ظهرت عليه الحُجَّة قال: إن الله تعالى قد يتكلم؛ ولكن كلامه مخلوق.

قلنا : وكذلك بنو آدم كلامهم مخلوق، فشبَّهتم الله حين زعمتم أن كلامه مخلوق، ففي مذهبكم أن الله قد كان في وقتٍ من الأوقات لا يتكلم حتى خلق

التكلم، وكذلك بنو آدم كانوا لا يتكلمون حتى خلق لهم كلامًا، فقد جمعتم بين كفر وتشبيه.

فتعالى الله عن هذه الصفة علوًّا كبيرًا.

بل نقول : إن الله لم يزل متكلماً إذا شاء، ولا نقول : إنه قد كان ولا يتكلم حتى خلق كلاماً .

ولا نقول : إنه قد كان ولا يعلم حتى خلق علِمًا فَعَلِمَ.

ولا نقول : إنه قد كان ولا قُدرة له حتى خلق لنفسه قُدرة.

ولا نقول : إنه كان قد كان ولا نورٌ له حتى خلق لنفسه نورًا.

ولا نقول : إنه قد كان ولا عظمة له حتى خلقه لنفسه عظمة.

فقالت الجهمية لنا لما وصفنا الله بهذه الصفات: إن زعمتم أن الله ونوره، والله وقدرته، والله وعظمته، فقد قلتم بقول النصارى حين زعموا أن الله لم يزل ونوره، ولم يزل وقدرته.

فقلنا : لا نقول : إن الله لم يزل وقُدرته، ولم يزل ونوره؛ ولكن نقول: لم يزل بقُدرته وبنوره، لا متى قدَر، ولا كيف قدَر.

فقالوا : لا تكونون موحِّدين أبدًا حتى تقولوا : قد كان الله ولا شيء.

فقلنا : نحن نقول : قد كان الله ولا شيء؛ ولكن إذا قلنا : إن الله لم يزل بصفاته كلها، أليس إنما نصف إلَهًا واحدًا بجميع صفته؟

وضربنا لهم في ذلك مثلًا؛ فقلنا : أخبرونا عن هذه النخلة؟ أليس لها، جذع، وكرب، وليف، وسعف، وخوص، وجُمَّار؟ واسمها اسم شيء واحد، وسُمِّيت: نخلة بجميع صفاتها، فكذلك الله سبحانه تعالى -وله المثل الأعلى- بجميع صفاته إله واحد.

ولا نقول : إنه قد كان في وقت من الأوقات ولا قُدرة له حتى خلق قدرة، والذي ليس له قدرة هو عاجز.

ولا نقول : قد كان في وقتٍ من الأوقات ولا علم له حتى خلق له علمًا فعلم، والذي لا يعلم هو جاهل.

ولكن نقول : لم يزل الله عالِمًا قادرًا مَالِكًا، لا متى؟ ولا كيف؟

وقد سمى الله رجلًا كافرًا اسمه : الوليد بن المغيرة المخزومي، فقال : ﴿ذَرۡنِى وَمَنۡ خَلَقۡتُ وَحِيدًا﴾ [المدثر - ١١]، وقد كان هذا الذي سماه الله وحيداً له عينان، وأذنان، ولسان وشفتان، ويدان ورجلان، وجوارح كثيرة، قد سمَّاه الله وحيدًا بجميع صفاته.

فكذلك الله - وله المثل الأعلى - هو بجميع صفاته إلٰه واحد.

٣٦ - ئيمامى أحمد بن حنبل رحمه الله دەڵێت :

کاتێ بەڵگەکان بەسەریاندا زاڵ بوون - واتە هیچ قسەیەکیان لا نەما - ، وتیان : الله قسەی کردووە لەگەڵ موسی، بەڵام کەلامی الله غەیری الله یە .

وتمان : وە غەیری الله ش مەخلوقە؟

وتیان : بەڵێ .

جا وتمان : ئەوە وەکو قسەی یەکەمتان بوو، ئیللا ئەوە نەبێ کە دەتانەوێت بەرگری لەو ناشرینیەی خۆتان بکەن بەوەی کە دەرتانخستووە .

وە فەرموودەی الزهري، وتی : کاتێ موسی کەلامی پەروەردگاری بیست، فەرمووی : ئەی پەروەردگار، ئەوەی بیستم کەلامی تۆیە؟

الله تعالى فەرمووی : بەڵێ ئەی موسی ئەوە کەلامی منە، وە من قسەم لەگەڵ کردی بە هێزی دە هەزار زمان، وە من هێزی هەموو زمانەکانم هەیە، وە من لەوەش بەهێزترم، بەڵام من قسەم لەگەڵ کردی بەپێی توانای جەستەت، ئەگەر لەوە زیاتر بوایە ئەوا دەمردیت .

- الزهري - وتی : کاتێ موسی گەڕایەوە بۆ ناو قەومەکەی، - قەومەکەی - وتیان : وەسفی کەلامی پەروەردگارت بۆمان بکە .

فەرمووی : سبحان الله، مەگەر دەتوانم بۆتان وەسف بکەم؟!

وتيان : بۆمانى بشوبهێنه - واته ویستیان به نزیکەیی بۆیان وەسف بکات - .

فەرمووی : ئایا دەنگی برووسکەتان بیستووە کە دێت و به خۆشترین شێوە دەیبیستن، وەکو بڵێی ئاوایە .

---

: بەهەمان شێوە حرب الكرماني لە (السنة : ٤١١) هاتووه، بەشێوەی مرفوع لە حەدیسی جابر رضي الله عنه هاتووه، صحيح نییه .

وە عبد الله بن أحمد لە (السنة : ٥٢٦)، لە وتەی کعب الأحبار رحمه الله هاتووه] .

وە بە جەهمیەکانمان وت : کێ لە ڕۆژی قیامەت بە عیسی علیه السلام دەفەرموێ : ﴿يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ءَأَنتَ قُلۡتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيۡنِ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ﴾ [المائدة - ١١٦] .

ئایا مەگەر الله قسەکارەکە نییە؟

وتیان : الله شتێکی دەهێنێتە بوون کە تەعبیر لە الله بکات، هەروەکو چۆن شتێکی درووست کرد کە تەعبیری بۆ موسی کرد .

وتمان : کێ قسەکاری ئەم وتەیەیە : ﴿فَلَنَسۡـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرۡسِلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَنَسۡـَٔلَنَّ ٱلۡمُرۡسَلِينَ (٦) فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيۡهِم بِعِلۡمٖۖ وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ (٧)﴾ [الأعراف] .

ئایا مەگەر ئەوە الله نییە کە دەپرسێت؟

وتیان : ئەوە هەمووی الله دەیهێنێتە بوون، تەعبیر لە الله دەکات .

بۆیە وتمان : ئێوە گەورەترین درۆتان بۆ الله هەڵبەست کاتێ پێتان وابوو کە قسە ناکات و چواندتان بەو بتانەی کە دەپەرستێن لە غەیری الله، چونکە بتەکان قسە ناکەن، وە ناتوانن دەرببڕن، وە ناجوڵێن، وە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر نارۆن .

جا کاتێ بەڵگەکان زاڵ بوون بەسەریاندا، وتیان : الله تعالى قسە دەکات، بەڵام کەلامەکەی مەخلوقە .

وتمان : وە هەروەها بەنی ئادەمیش قسەکانیان مەخلوقە، کەواتە الله تان تەشبیهـ کرد کاتێ پێتان وابوو کە کەلامەکەی مەخلوقە، وە لە مەزهەب و ڕێبازی ئێوەدا ئەوەیە کە الله لە کاتێ لە کاتەکان قسە ناکات تاوەکو قسە کردنی درووست کرد، وە بەهەمان شێوە بەنی ئادەم قسە ناکەن تاوەکو الله قسەیان بۆ درووست دەکات، جا ئێوە نێوانی کوفر و تەشبیهتان کۆکردەوە .

الله تعالى دوورە لەو سیفەتانەی ئەوان باسی دەکەن وە بەرز و گەورەیە .

بەڵکو دەڵێین : الله لە ئەزەلەوە قسەی کردووە هەر کات ویستبێتی،

وه نالّێین : ئەو هەبووە و قسەی نەکردووە هەتاوەکو قسە کردنی درووست کردووە .

وه نالّێین : ئەو هەبووە و عیلمی نەبووە و هەتاوەکو عیلمی درووست کردووە ئینجا عیلمی هەبووە .

وه نالّێین : ئەو هەبووە و توانای نەبووە هەتاوەکو توانا و دەسەڵاتی بۆ خۆی درووست کردووە .

وه نالّێین : ئەو هەبووە و هیچ نوری نەبووە هەتاوەکو نوری بۆ خۆی درووست کردووە .

وه نالّێین : ئەو هەبووە و گەورەیی و مەزنی نەبووە هەتاوەکو گەورەیی و مەزنی بۆ خۆی درووست کردووە .

کاتێ ئێمە الله مان بەم شێوەیە وەسف کرد جەهمیەکان بە ئێمەیان وت : ئەگەر پێتان وایە کە لە ئەزەلەوە الله و نورەکەی، وە الله و توانا و دەسەڵاتی، وە الله و گەورەییەکەی هەبوونە، ئەوا هەمان قسەی نەصاراتان کردووە کاتێ پێیان وابوو لە ئەزەلەوە الله و نور و دەسەڵاتەکەی هەبوونە - والله اعلم، ئەوان مەبەستیان ئەوەیە کە ئێمە نور و قودرەت و گەورەییەکەی دەکەینە شەریک بۆی لەبەر ئەوەیە کە دەڵێن وتەی نەصاراتان وتوەتەوە - .

وتمان : ئێمە ناڵێین : لە ئەزەلەوە الله و قودرەتی الله هەبووە، وە لە ئەزەلەوە الله و نوری الله هەبووە - چونکە جیاکاریە لە نێوان الله و سیفەتەکەی وەک ئەوەیە کە بڵێی سیفاتی الله شتێکی جیایە لە الله، ئەهلی سوننەش نە دەڵێن سیفاتی الله جیایە لە الله، وە نە دەڵێن سیفاتی الله بریتیە لە الله، بەڵکو وەسف دەکەن بە سیفاتەکانی - .

بەڵکو دەڵێین : الله لە ئەزەلەوە هەبووە بە قودرەتەکەی و بە نورەکەی - واتە ئەم سیفەتانە جیاناکەنەوە لە الله، الله لە ئەزەلەوە ئەم سیفەتانەی هەبووە هیچ کات لێی دانەبڕاوە، بەڵام کە وترا الله لە ئەزەلەوە هەبوە و سیفەتی قودرەتیش لە ئەزەلەوە هەبووە وا دەردەکەوێ کە سیفەتەکانی الله جیا بن لە الله - .

- وە ناڵێین - کەی ئەم قودرەتەی بۆ پەیدا بووە، وە باسی چۆنیەتی ئەو قودرەتە ناکرێ - واتە لە ئەزەلەوە الله ئەم سیفەتەی هەبووە و سەرەتای نییە - .

وتیان : هەرگیز نابن بە یەکخواپەرست تاوەکو نەڵێن : الله هەبووە و هیچ شتێکی تر بوونی نەبووە .

وتمان : ئێمە دەڵێین : الله هەبووە و هیچ شتێکی تر بوونی نەبووە، بەڵام گەر وتمان : الله لە ئەزەلەوە هەموو سیفاتەکانی هەبووە، ئایا مەگەر ئەوکات وەسفی خوایەکی تاک و تەنهامان نەکردووە بە هەموو سیفاتەکانیەوە؟

دەربارەی ئەمەش نمونەیەکمان بۆ هێنانەوە، وتمان : دەربارەی ئەم خورمایە پێمان بڵێن؟

ئایا مەگەر قەد و ڕەگ و گەڵا و پەل و بەروبوومی نیە؟ جا لەگەڵ ئەوەشدا یەک ناوی هەیە، ناوی لێنراوە : خورما بە هەموو سیفاتەکانیەوە، بە هەمان شێوە بۆ الله سبحانه وتعالی و له المثله الاعلی، بە هەموو سیفاتەکانیەوە خوایەکی تاکە .

ناڵێین : ئەو لە کاتێ لە کاتەکان قودرەتی نەبووە هەتاوەکو قودرەتی درووست کردووە، چونکە ئەوەی کە قودرەتی نییە ئەوا بێ توانایە .

وە ناڵێین : ئەو کاتێ لە کاتەکان عیلمی نەبووە هەتاوەکو علمی درووست کردووە ئینجا علمی هەبوور، چونکە ئەوەی کە نازانێت و عیلمی نییە ئەوا جاهل و نەزانە .

بەڵکو دەڵێین : هەمیشە الله بەتوانا و دەسەڵات و زانا و خاوەن موڵکە، - نابێ بڵێین - کەی؟ وە چۆن؟

الله تعالی ناوی پیاوێکی کافری برد : الوليد بن المغيرة المخزومي - باوکی خالد بن الوليد - ، فەرمووی : ﴿ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا﴾ [المدثر - ١١] .

الله تعالی ناوی تەنیای لێ نا، کەچی دوو چاو و دوو گوێی هەبووە، وە زمان و دوو لێوی هەبووە، وە دوو دەست و دوو قاچی هەبووە، وە ئەندامی زیاتر، -

بەڵام الله تعالى - لەگەڵ گشت سیفاتەکانی ئەو پیاوە کە هەیەتی یەک ناوی لێنا تەنیا .

به هەمان شێوە بۆ الله سبحانە وتعالى و لە المثلە الاعلى، بە هەموو سیفاتەکانیەوە خوایەکی تاکە .



# باب (١١)

## بيان ما أنكرت الجهمية الضلال أن يكون الله على العرش



**٣٧** - فقلنا لهم : لِمَ أنكرتم أن يكون الله سبحانه على العرش، وقد قال سبحانه: ﴿ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ﴾ [طه : ٥] .

وقال : ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ﴾ [الحديد - ٤].

فقالوا: هو تحت الأرضين السابعة، كما هو على العرش، فهو على العرش، وفي السمٰوات، وفي الأرض، وفي كل مكان، ولا يخلو منه مكان، ولا يكون في مكانٍ دون مكان وتلو آيةً من القرآن: ﴿وَهُوَ ٱللَّهُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَفِى ٱلْأَرْضِ﴾ [الأنعام - ٣].

فقلنا : قد عرف المسلمون أماكن كثيرة وليس فيها من عِظمِ الرب شيء.

فقالوا : أيُّ مكان؟

فقلنا : أحشاؤكم، وأجوافكم، وأجواف الخنازير، والحشوش، والأماكن القذرة ليس فيها من عِظمِ الرب شيء.

وقد أخبرنا أنه في السماء، فقال سبحانه : ﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ (١٦) أَمۡ أَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ حَاصِبٗاۖ (١٧)﴾ [الملك] .

وقال : ﴿إِلَيۡهِ يَصۡعَدُ ٱلۡكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلۡعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرۡفَعُهُۥ﴾ [فاطر - ١٠] .

وقال : ﴿إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ﴾ [آل عمران - ٥٥] .

وقال : ﴿بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيۡهِۚ﴾ [النساء - ١٥٨] .

وقال : ﴿وَلَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَمَنۡ عِندَهُۥ﴾ [الأنبياء - ١٩] .

وقال : ﴿يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوۡقِهِمۡ﴾ [النحل - ٥٠] .

وقال : ﴿ذِي ٱلۡمَعَارِجِ (٣) تَعۡرُجُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيۡهِ (٤)﴾ [المعارج : ٣، ٤].

وقال : ﴿وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦۚ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ﴾ [الأنعام - ١٨].

وقال : ﴿وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ﴾ [البقرة - ٢٥٥] .

فهذا خبر الله أخبرنا أنه في السماء، ووجدنا كل شيء أسفل مذمومًا، قال جلَّ ثناؤه: ﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ﴾ [النساء - ١٤٥] .

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ رَبَّنَآ أَرِنَا ٱلَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ ٱلْأَسْفَلِينَ﴾ [فصلت - ٢٩] .

وقلنا لهم : أليس تعلمون أن إبليس مكانه السفل، والشياطين كذلك مكانهم، فلم يكن الله ليجتمع هو وإبليس في مكان واحد.

وإنما معنى قول الله جلَّ ثناؤه : ﴿وَهُوَ ٱللَّهُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَفِى ٱلْأَرْضِ﴾ [الأنعام - ٣] .

يقول : هو إلٰه من في السمٰوات، وإله من في الأرض، وهو على العرش، وقد أحاط علمه بما دون العرش، لا يخلو من علم الله مكان، ولا يكون علم الله في مكانٍ دون مكان.

فذلك قوله : ﴿لِتَعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىْءٍ عِلْمًا﴾ [الطلاق - ١٢] .

قال : ومن الاعتبار في ذلك، لو أن رجلًا كان في يديه قدحٌ من قوارير صافٍ، وفيه شراب صافٍ، كان بصر ابن آدم قد أحاط بالقدح من غير أن يكون ابن آدم في القدح.

فالله سبحانه - وله المثل الأعلى - قد أحاط بجميع خلقه، من غير أن يكون في شيءٍ من خلقه.

وخصلة أُخرى :

لو أن رجلًا بنى دارًا بجميع مرافقها، ثم أغلق بابها وخرج منها، كان ابن آدم لا يخفى عليه كم بيت في داره، وكم سعة كل بيت من غير أن يكون صاحب الدار في جوف الدار.

فالله سبحانه -وله المثل الأعلى- قد أحاط بجميع خلقه، وعلم كيف هو، وما هو من غير أن يكون في شيء مما خلق.

# باب (١١)

## دەرخستنی ئەوەی جەهمیە گومڕاکان ئینکاریان کرد لەوەی کە الله لەسەر عەرش بێت



**٣٧** - پێمان وتن: بۆچی ئینکاری ئەوە دەکەن کە الله سبحانە و تعالى لەسەر عەرش بێت، لە کاتێکدا الله فەرموویەتی: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ﴾ [طە. ٥].

وە فەرموویەتی: ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ﴾ [الحديد - ٤].

وتیان: الله لە خوارووی حەوت زەویەکەیە، هەروەکو چۆن لەسەر عەرشە، وە الله لەسەر عەرشە، وە لە ئاسمانەکانە، وە لە زەویە، وە لەهەموو شوێنێکە، هیچ شوێنێک خاڵی نییە لە الله، وە ناکرێت لەشوێنێک بێت و لەشوێنێکی تر نەبێت، وە ئایەتێکی قورئانیان خوێندەوە: ﴿وَهُوَ ٱللَّهُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ [الأنعام - ٣].

بۆیه وتمان : موسڵمانان شوێنی زۆر دەزانن كه هیچ گەورەییەكی بۆ پەروەردگار تێدا نییه - واته لایەق بە گەورەییەكەی نییه - .

وتیان : كامه شوێن؟

وتمان : پاشەڕۆكانتان، و ناختان، وه ناخی بەراز، و پاشەڕۆكان، وه شوێنه پیسەكان كه هیچ گەورەییەكیان بۆ پەروەردگار تێدا نییه .

وه پێمان ڕاگەیەنراوه كه الله له ئاسمانه، الله فەرموویەتی : ﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ (١٦) أَمۡ أَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ حَاصِبٗاۖ (١٧)﴾ [الملك] .

وه فەرموویەتی : ﴿إِلَيۡهِ يَصۡعَدُ ٱلۡكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلۡعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرۡفَعُهُۥ﴾ [فاطر - ١٠] .

وه فەرموویەتی : ﴿إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ﴾ [آل عمران - ٥٥] .

وه فەرموویەتی : ﴿بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيۡهِۚ﴾ [النساء - ١٥٨] .

وه فەرموویەتی : ﴿وَلَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَمَنۡ عِندَهُۥ﴾ [الأنبياء - ١٩] .

وه فەرموویەتی : ﴿يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوۡقِهِمۡ﴾ [النحل - ٥٠] .

وە فەرموویەتی : ﴿ذِى ٱلْمَعَارِجِ (٣) تَعْرُجُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ (٤)﴾ [المعارج]
.

وە فەرموویەتی : ﴿وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ﴾ [الأنعام - ١٨].

وە فەرموویەتی : ﴿وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْعَظِيمُ﴾ [البقرة - ٢٥٥].

جا ئەمە هەواڵی الله یە، پێمانی ڕاگەیاندووە کەوا لە ئاسمانە، وە بینیمان هەموو شتێکی زەمکراو لە خوارەوەیە، هەروەکو الله جلَّ ثناؤە دەفەرموێت : ﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ﴾ [النساء - ١٤٥].

وە فەرموویەتی : ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ رَبَّنَآ أَرِنَا ٱلَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ ٱلْأَسْفَلِينَ﴾ [فصلت - ٢٩].

وە پێمان وتن : ئایا نەتانزانیوە کەوا ئیبلیس شوێنەکەی خوارەوەیە، وە شەیتانەکان بەهەمان شێوەیە شوێنەکانیان، جا ناکرێ الله و ئیبلیس لەیەک شوێندا کۆنابنەوە.

بەڵکو مانای فەرمایشتی الله جلَّ ثناؤە : ﴿وَهُوَ ٱللَّهُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَفِى ٱلْأَرْضِ﴾ [الأنعام - ٣].

دەفەرمووێت : ئەو - الله - ی هەرچی لە ئاسمانەکانە، وە هەرچی لە زەویدایە، وە ئەو لەسەر عەرشە، عیلمەکەی هەمووشتێکی ژێر عەرشی

گرتووەتەوە - واتە عەرش بەرزترین و گەورەترین درووستکراوە الله لەسەر عەرشەو عیلمەکەی هەمووشتێکی گرتۆتەوە بە عەرش و ئەوەی لەژێر عەرش یشە واتە هەموو مەخلوقات - ، هیچ شوێنێک خاڵی نییە لە عیلمی الله، وە ناکرێ عیلمی الله لە شوێنێک بێت و لەشوێنێکی تر نەبێت .

ئەمەش وەکو فەرمایشتی الله یە کە دەفەرموێ : ﴿لِتَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدۡ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عِلۡمَۢا﴾ [الطلاق - ١٢] .

وتی : جا نمونەیەک وەکو تەعبیر کردن لەمە، ئەوەیە ئەگەر پیاوێک کوپێکی لە شوشەیەکی ساف بە دەستیەوە بێت، لە ناو ئەو کوپە خواردنەوەیەکی ساف و خاوێنی تێدابێت، ئەوا بینینی بەنی ئادەمەکە هەموو کووپەکە دەگرێتەوە بێ ئەوەی لە ناو کووپەکەشدا بێت .

بەم شێوەیەش الله سبحانه و تعالى - و لە المثل الاعلى - ، زانیاریەکەی هەموو شتێکی گرتۆتەوە بە بێ ئەوەی کە خۆی لە ناو هیچ شتێک لە مەخلوقەکانیدا بێت .

وە نموونەیەکی تر :

گەر پیاوێک ماڵێک درووست بکات بە هەموو شتە ئەساسیەکانی ماڵ و بۆی ڕێک بخات، پاشان دەرگاکە دابخات و بڕواتە دەرەوە، ئەوا بەنی ئادەمەکە لای شاراوە نییە کە چەند ژوور لەو ماڵەی ئەودایە، وە هەر ژوورێک چەند پانە بێ ئەوەی خاوەنی ماڵەکە لە ناو ماڵەکەشدا بێت .

بەم شێوەیەش الله سبحانە و تعالى - و لە المثل الاعلى - ، زانیاریەکەی هەموو شتێکی گرتۆتەوە بە بێ ئەوەی کە خۆی لە ناو هیچ شتێک لە مەخلوقەکانیدا بێت .



# باب (١٢)

## بيان ما تأولت الجهمية من قول الله تعالى : ﴿مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَـٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ﴾ [المجادلة – ٧]



**٣٨** - قالوا : إن الله معنا وفينا .

فقلنا : لم قطعتم الخبر من أوله، إن الله عزَّ وَجَلّ يقول : ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾، ثم قال: ﴿مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَـٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ﴾؛ يعني: أن الله بعلمه رابعهم، ﴿وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ﴾؛ يعني: الله بعلمه، ﴿سَادِسُهُمْ وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ﴾؛ يعني: بعلمه فيهم، ﴿أَيْنَ مَا كَانُواْ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُواْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾، يفتح الخبر بعلمه، ويختم الخبر بعلمه .

ويقال للجهمي: إذا قال: إن الله إذا كان معنا بعظمة نفسه، فقل له: هل يغفر الله لكم فيما بينه وبين خلقه؟

فإن قال: نعم؛ فقد زعم أن الله بائنٌ من خلقه وأن خلقه دونه.

# باب (١٢)

## دەرخستنی ئەوەی جەهمیەکان تەئویلی ئەم فەرمایشتەی الله یان کرد : ﴿مَا يَكُونُ مِن نَّجوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُم وَلَا خَمسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُم﴾ [المجادلة - ٧]



**٣٨** - جەهمیەکان - وتیان : الله عز و جل لەگەڵماندایە و لەناوماندایە .

وتمان : بۆچی ئەو هەواڵەتان لە سەرەتاکەیەوە پچڕاند، الله تعالى دەفەرموێت : ﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ﴾ پاشان فەرمووی : ﴿مَا يَكُونُ مِن نَّجۡوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمۡ﴾، واتە : الله بە علمەکەی چوارەمینیانە - واتە کە سێ کەس قسە دەکەن و دەچرپێنن ئەوا چوارەمیان الله یە بەڵام دەبێت بڵێین بە علمەکەی لەگەڵیانە نەک بە زات - .

﴿وَلَا خَمۡسَةٍ إِلَّا هُوَ﴾، واتە : الله بە علمەکەی .

﴿سَادِسُهُمۡ وَلَآ أَدۡنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكۡثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمۡ﴾، واتە : بە علمەکەی لەناویاندایە .

﴿أَيْنَ مَا كَانُواْۖ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُواْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾، جا بە علمەکەی دەستی کردووە بە باسکردنی هەواڵەکە، وە هەر بە علمەکەی کۆتاییشی پێ هێناوە .

: لە الإبانة الکبرى لإبن بطة العکبري (٢٦٨٩)، لە الضحاك لەم ئایەتەدا : ﴿مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ﴾، وتی : الله لەسەر عەرشە وە بە علمەکەی لەگەڵیانە .

ئیمامی أحمد بن حبل وتی : ئا ئەوەیە سوننەت.

وە بە جەهمیەکان دەوترێ : ئەگەر وتی : الله لەگەڵمانە بە گەورەیی خودی خۆی، ئەوا پێی بڵێ : ئایا الله لێتان خۆشدەبێت لەوەی لەنێوان الله و درووستکراوانیدا هەیە؟

ئەگەر وتی : بەڵێ، ئەوا پێی وایە کە الله لە درووستکراوەکانی جیایە و مەخلوقەکانی لەودا نین .

وە ئەگەر وتی : نەخێر، ئەوا کوفری کردووە .



# باب (١٣)



**٣٩** - وإذا أردت أن تعلم أن الجهمي كاذب على الله حين زعم أن الله في كل مكان، ولا يكون في مكان دون مكان، فقل: أليس الله كان ولا شيء؟

فيقول: نعم.

فقل له: حين خلق الشيء خلقه في نفسه، أو خارجًا من نفسه؟ فإنه يصير إلى ثلاثة أقوال، لا بُدَّ له من واحد منها.

**أ** - إن زعم أن الله خلق الخلق في نفسه؛ فقد كفر حين زعم أن الجن والإنس والشياطين في نفسه.

**ب** - وإن قال : خلقهم خارجًا من نفسه ثم دخل فيهم، كان هذا أيضًا كفرًا حين زعم أنه دخل في مكان وحُشٍّ قذرٍ رديء.

**ج** - وإن قال : خلقهم خارجًا من نفسه، ثم لم يدخل فيهم؛ رجع عن قوله كله أجمع، وهو قول أهل السُّنَّة.

# باب (١٣)



**٣٩** - وە ئەگەر ویستت بزانیت کەوا جەهمیەکان درۆیان دەربارەی اللە کردووە ئەو کاتەی پێیان وابوو کەوا اللە لەهەموو شوێنێکە، و ئەوە نیە لە شوێنێک بێت و لەشوێنێک نەبێت، ئەوا بڵێ : ئایا مەگەر اللە هەر نەبووە و هیچ شتێکیش بوونی نەبووە؟

دەڵێت : بەڵێ .

پێی بڵێ : کاتێ شتێکی درووست کرد، ئایا لە ناو خودی خۆیدا درووستی کرد، یان لە دەرەوەی خودی خۆی؟

جا بۆ سێ وتە دەچێت، لەو سێیە دەرناچێت دانەیەکیانی هەر تێدایە .

**أ** - ئەگەر پێی وابێت کە مەخلوقەکانی لە ناو خودی خۆیدا درووست کردووە ئەوا کوفری کردووە چونکە لەو کاتەدا پێی وایە کەوا جن و ئینسانەکان و شەیتانەکان لە نەفسی اللە دان .

ب - وە ئەگەر وتی : دروستی کردوون لە دەرەوەی خودی خۆی پاشان چووەتە ناویان، ئەوەش بەهەمان شێوە کوفرە چونکە لەو کاتەدا پێی وایە کەوا دەچێتە شوێنی پاشەڕۆ و پیس و خراپ .

ج - وە ئەگەر وتی : لە دەرەوەی نەفسی خۆی دروستیی کردوون، پاشان نەچووەتە ناویانەوە، ئەوا لە هەموو قسەکانی پاشگەز بۆتەوە، کە ئەویش قەولی ئەهلی سوننەیە .



# باب (١٤)



**٤٠** - قال أحمد رحمه الله :

إذا أردت أن تعلم أن الجهمي لا يقرُّ بعلم الله؛ فقل له:

إن الله تعالى يقول : ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ﴾ [البقرة - ٢٥٥] .

وقال : ﴿لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشۡهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيۡكَۖ أَنزَلَهُۥ بِعِلۡمِهِۦ﴾ [النساء - ١٦٦] .

وقال : ﴿فَإِلَّمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَكُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلۡمِ ٱللَّهِ﴾ [هود - ١٤] .

وقال : ﴿وَمَا تَخۡرُجُ مِن ثَمَرَٰتٖ مِّنۡ أَكۡمَامِهَا وَمَا تَحۡمِلُ مِنۡ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلۡمِهِۦ﴾ [فصلت - ٤٧] .

فيقال له : تقرُّ بعلم الله هذا الذي أوقفتك عليه بالأعلام والدلالات أم لا ؟

فإن قال : ليس له علمٌ، فقد كفر.

وإن قال : لله علمٌ مُحدث كفر أيضًا حين زعم أن الله قد كان في وقتٍ من الأوقات لا يعلم حتى أحدث له علمًا فعَلِم.

فإن قال : لله علمٌ وليس بمخلوقٍ ولا محدثٍ، رجع عن قوله كله، وقال بقول أهل السُّنَّة.



# باب (١٤)



**٤٠** - ئيمامی أحمد رحمه الله وتی :

ئەگەر ویستت بزانی کەوا جەهمیەکان دان بە عیلمی الله دا نانێن، ئەوا پێی بڵێ :

الله تعالی دەفەرموێت : ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِشَىْءٍ مِّنْ عِلْمِهِ﴾ [البقرة - ٢٥٥] .

وە دەفەرمووێت : ﴿لَّكِنِ ٱللَّهُ يَشْهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُۥ بِعِلْمِهِ﴾ [النساء - ١٦٦] .

وە دەفەرمووێت : ﴿فَإِلَّمْ يَسْتَجِيبُواْ لَكُمْ فَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلْمِ ٱللَّهِ﴾ [هود - ١٤] .

وە دەفەرمووێت : ﴿وَمَا تَخْرُجُ مِن ثَمَرَٰتٍ مِّنْ أَكْمَامِهَا وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِ﴾ [فصلت - ٤٧] .

جا پێی دەوترێ : ئایا دان بە عیلمی الله دەنێی بەوەی کە موافەقەم پێت کرد لەسەری بە ڕوونی و بە بەڵگەکان یاخود نا؟

ئەگەر وتی : اللّٰه عیلمی نییە، ئەوا كـوفری كـردووە .

وە ئەگەر وتی : اللّٰه علمێكی تازە و داهێنراوی هەیە بە هەمان شێوە كـوفری كـردووە چونكـە لەو كـاتەدا پێی وایە كـەوا اللّٰه لە كـاتێكـەوە بۆ كـاتێكـی تر عیلمی نەبووە تاوەكـو عیلمێكـی داهێناوە و ئینجا عیلمی هەبووە .

وە ئەگەر وتی : اللّٰه علمی هەیە و مەخلوق و داهێنراو و تازە نییە، ئەوا لە هەموو قسەكـانی پاشگەز بۆتەوە، وە هەمان قسەی ئەهلی سوننەی كـردووە .



# باب (١٥)

## بيان ما ذكر الله في القرآن : ﴿وَهُوَ مَعَكُم﴾



**٤١** - وهذا على وجوه :

قال الله تعالى لموسى : ﴿إِنَّنِى مَعَكُمَآ أَسۡمَعُ وَأَرَىٰ﴾ [طه - ٤٦].

يقول : في الدفع عنكما.

وقال : ﴿ثَانِىَ ٱثۡنَيۡنِ إِذۡ هُمَا فِى ٱلۡغَارِ إِذۡ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحۡزَنۡ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَاۖ﴾ [التوبة : ٤٠] .

يقول : في الدفع عنا.

وقال : ﴿كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتۡ فِئَةً كَثِيرَةَۢ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ [البقرة - ٢٤٩] .

يقول : في النصر لهم على عدوهم.

وقوله : ﴿فَلَا تَهِنُواْ وَتَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱلسَّلۡمِ وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ وَٱللَّهُ مَعَكُمۡ﴾ [محمد - ٣٥] .

في النصر لكم على عدوكم.

﴿وَلَا يَسۡتَخۡفُونَ مِنَ ٱللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمۡ﴾ [النساء - ١٠٨] .

يقول : بعلمه فيهم.

وقوله : ﴿فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلۡجَمۡعَانِ قَالَ أَصۡحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدۡرَكُونَ (٦١) قَالَ كَلَّآۖ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهۡدِينِ (٦٢)﴾ [الشعراء]

يقول : في العون على فرعون.

# باب (١٥)

## ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە الله باسی کردووە لە قورئان : ﴿وَهُوَ مَعَكُم﴾



**٤١** - ئەمەش چەند ڕوویەکی هەیە :

فەرمایشتی الله تعالى بۆ موسى عليه السلام : ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَآ أَسۡمَعُ وَأَرَىٰ﴾ [طه - ٤٦] .

دەفەرمووێت : بۆ پاراستنی ئێوە - واتە دەتانپارێزین - .

وە دەفەرمووێت : ﴿ثَانِيَ ٱثۡنَيۡنِ إِذۡ هُمَا فِي ٱلۡغَارِ إِذۡ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحۡزَنۡ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَاۖ﴾ [التوبة : ٤٠] .

دەفەرمووێت : بۆ پاراستنی ئێمە - واتە الله دەمان پارێزێ - .

وە دەفەرمووێت : ﴿كَم مِّن فِئَةٖ قَلِيلَةٍ غَلَبَتۡ فِئَةٗ كَثِيرَةَۢ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ [البقرة - ٢٤٩] .

دەفەرمووێت : بۆ سەرکەوتنیان بەسەر دوژمنەکانیان - واتە لەگەڵ ئەوانین و سەریان دەخەین بەسەر ئەوانەی دوژمنایەتی دینی الله دەکەن - .

وە دەفەرمووێت : ﴿فَلَا تَهِنُواْ وَتَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱلسَّلۡمِ وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ وَٱللَّهُ مَعَكُمۡ﴾ [محمد - ٣٥] .

له سەرکەوتن بەسەر دوژمنەکەتان - لەگەڵتانە - .

﴿وَلَا يَسۡتَخۡفُونَ مِنَ ٱللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمۡ﴾ [النساء - ١٠٨] .

دەفەرمووێت : بە عیلمەکەی لە نێویانە .

وە دەفەرمووێت : ﴿فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلۡجَمۡعَانِ قَالَ أَصۡحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدۡرَكُونَ (٦١) قَالَ كَلَّآۖ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهۡدِينِ (٦٢)﴾ [الشعراء] .

دەفەرمووێت : بۆ یارمەتی - بۆ سەرکەوتن - بەسەر فیرعەوندا .



**٤٢** - فلما ظهرت الحُجَّة على الجهمي بما ادَّعى على الله أنه مع خلقه، قال : هو في كلِّ شيءٍ، غير مماسٍّ لشيءٍ، ولا مُباينٍ منه.

فقلنا : إذا كان غير مُباينٍ منه أليس هو مماسًّا؟

قال : لا.

قلنا : فكيف يكون في كلِّ شيءٍ غير مماسٍّ لشيءٍ ولا مباين؟

فلم يُحسن الجواب.

فقال : بلا كيف.

فخدع الجُهَّال بهذه الكلمة وموَّه عليهم.

فقلنا : أليس إذا كان يوم القيامة، أليس إنما هو الجنة والنار والعرش والهواء؟

قال : بلى.

فقلنا : فأين يكون ربنا تبارك وتعالى؟

قال : يكون في كل شيء، كما كان حين كان في الدنيا في كال شيء.

فقلنا : فإن في مذهبكم : أنَّ ما كان من الله على العرش فهو على العرش، وما كان من الله في الجنة فهو في الجنة، وما كان من الله في النار فهو في النار، وما كان من الله في الهواء فهو في الهواء.

فعند ذلك تبيَّن كذبهم على الله جلَّ ثناؤه.

قال : زعمت الجهمية أن الله في القرآن إنما هو اسم مخلوق، فقلنا: قبل أن يخلق هذا الاسم ما كان اسمه؟

قالو : لم يكن له اسم.

فقلنا : وكذلك قبل أن يخلق العلم أكان جاهلاً لا يعلم حتى خلق لنفسه علمًا، وكان لا نور له حتى خلق لنفسه نورًا، وكان ولا قُدرة له حتى خلق لنفسه قدرة؟

فعلم الخبيث أن الله قد فضحه، وأبدى عورته للناس حين زعم أن الله جلَّ ثناؤه في القرآن إنما هو اسم مخلوق.

**٤٢** - جا كاتێ بەڵگەكان زاڵ بوون بەسەر جەهمیەكاندا سەبارەت بەوەی كە بانگەشەیان دەكرد لەسەر الله كە ئەو لەگەڵ مەخلوقەكانیەتی، وتیان :

الله لە هەموو شتێك دایە، بەر هیچ شتێك ناكەوێت، و لێشی جیا نییە

.

وتمان : گەر لێی جیانەبێ ئایا بەریناكەوێ؟

وتی : نەخێر .

وتمان : ئەی چۆن دەکرێت لەهەموو شتێکدا بێ و بەر هیچ شتێکیش نەکەوێت و لێشی جیا نەبێ ؟

جا وەڵامێکی جوانیان بۆ نەدرایەوە .

وتی : بەبێ چۆنیەتی .

جا بەم قسەیە نەزانەکان فێڵیان لێ کرا و چەواشە کران .

وتمان : ئایا مەگەر لە ڕۆژی قیامەتدا بەهەشت و دۆزەخ و عەرش و هەوای لێ نییە ؟

وتی : بەڵێ .

وتمان : - ئەو کات - پەروەردگارمان تبارک و تعالی لە کوێ دەبێ ؟

وتی : لە هەموو شتێکدا دەبێ، هەروەکو چۆن لە دونیادا لە هەموو شتێکدا بوو .

وتمان : لە مەزهەب و ڕێبازی ئێوەدایە : کە ئەوەی الله لەسەر عەرشە ئەوا لەسەر عەرشە، وە ئەوەی لە الله لە بەهەشتە ئەوا لە بەهەشتە، وە ئەوەی لە الله لە دۆزەخە ئەوا لە دۆزەخە، وە ئەوەی الله لە هەوایە ئەوا لە هەوایە - واتە کاتێ ئەوان دەڵێن الله لە هەموو شوێنێکە کەواتە ئەوە عەقیدەیان دەبێت کە بڵێن ئەو بەشەی الله کە لە بەهەشتە ئەوا لە بەهەشتە، وە ئەو بەشەی الله کە لە دۆزەخە ئەوا لە

دۆزەخە، واتە ئەوان مولزەم دەبن بەوەی کە بڵێن بەشێکی الله لە بەهەشتە و بەشێکی لە دۆزەخە و بەشێکی لە هەوایە - .

ئا لەمەدا درۆکانیان دەرکەوت دەربارەی الله جلَّ ثناؤه .

وتی : جەهمییەکان پێیان وابوو کە الله لە قورئاندا ناوێکی مەخلوقە، بۆیە وتمان : پێش ئەوەی ئەم ناوە دروست بکات، ناوی چی بوو ؟

وتیان : ناوی نەبوو .

بۆیە وتمان : کەواتە بە هەمان شێوە پێش ئەوەی عیلم دروست بکا ئایا نەزان بوو و هیچی نەدەزانی هەتاوەکو عیلمی بۆ خۆی دروست کرد؟، وە هیچ نورێکی نەبوو هەتاوەکو نوری بۆ خۆی دروست کرد؟ وە هیچ قودرەتی نەبوو هەتاوەکو قودرەتی بۆ خۆی دروست کرد؟

جا ئەو پیسە لەوێدا بۆی دەرکەوت کە الله فەزح و ناشرینی کردووە، و عەورەتی بۆ خەڵکی هەڵداوەتەوە کاتێ پێی وابوو الله جلَّ ثناؤه لە قورئاندا ناوێکی مەخلوقە .



**٤٣** - وقلنا للجهمي: لو أن رجلاً حلف بالله الذي لا إله إلَّا هو كاذباً كان لا يحنث؛ لأن حلف بشيءٍ مخلوق، ولم يحلف بالخالق، ففضحه الله في هذه.

وقلنا له : أليس النبي ﷺ وأبو بكر وعمر وعثمان وعلي والخلفاء رضي الله عنهم من بعدهم، والحكام والقضاة، إنما كانوا يُحلِّفون الناس بالله الذي لا إلٰه إلَّا هو؟ فكانوا في مذهبهم مخطئين، إنما كان ينبغي للنبي ﷺ ولمن بعده في مذهبكم أن يُحلِّفوا الناس بالذي خلق اسم (الله)، وإذا أرادوا أن يقولوا: لا إلٰه إلَّا الله، أن يقولون: لا إلٰه إلَّا الذي خلق اسم الله، وإلَّا لم يصح توحيدهم، ففضحه الله عزَّ وَجَلّ بما ادَّعى على الله الكذب.

ولكن نقول : إن (الله) هو (الله)، وليس (الله) باسم، إنما الأسماء كل شيء سوى (الله)؛ لأن الله يقول: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ﴾ [الأعراف - ١٨٠]، ولا أن يكون اسمٌ لاسمٍ.

ففي هذا بيان كفر الجهمية.

**٤٣** - وه به جه‌همییه‌كانمان وت : گه‌ر كه‌سێ سوێندێكی خوارد به‌و اللّٰه یه‌ی كه‌ هیچ خوایه‌ك نییه‌ به‌ حه‌ق شایه‌نی په‌رستن بێت جگه‌ له‌ ئه‌و ئه‌وا سوێنده‌كه‌ی نه‌شكاندووه‌، چونكه‌ سوێندی به‌ شتێكی مه‌خلوق خواردووه‌، و سوێندی به‌ خالق نه‌خواردووه‌، جا لێره‌دا اللّٰه فه‌زح و ناشرینی كردن .

پێمان وتن : ئایا پێغەمبەر ﷺ و أبو بكر و عمر و عثمان و علي و خەلفەكانی دوای ئەوانیش رضي الله عنهم، وە پێشەوایان و دادوەرەكان، مەگەر وایان لە خەڵكەكە نەدەكرد سوێند بخۆن بەو الله یەی كە هیچ خوایەك نییە بە حەق شایەنی پەرستن بێت جگە لە ئەو؟ كەواتە لە ڕێباز و مەزهەبەكەیان هەڵە بوونە، دەبوو پێغەمبەر ﷺ و ئەوانەی دوای خۆی لە مەزهەبەكەیان وا خەڵكەكە بكەن كە سوێند بخۆن بەو كەسەی كە ناوی (الله) ی دروست كردووە، وە دەبوو ئەگەر بیانویستایە بڵێن : لا إله إلا الله، ئەوا دەبوو بڵێن : هیچ خوایەك نییە بە حەق شایەنی پەرستن بێت جگە لەو الله یەی كە ناوی (الله) ی دروست كردووە، ئەگینا تەوحیدەكەیان دروست نابێت، بۆیە الله تعالى فەزح و ناشرینی كردن لەبەر درۆیەی كە سەبارەت بە الله كردیان .

بەڵكو دەڵێین : (الله) هەر (الله) یە، وە (الله) ناو نییە، بەڵكو ناوەكان هەموو شتێكن جگە لە (الله)، لەبەرئەوەی الله دەفەرموێت : ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ﴾ [الأعراف - ١٨٠]، ناكرێت ناوێك بۆ ناوێكی تر بێت .

جا لەمەدا كوفری جەهمیەكان دەركەوت .



**٤٤** - وقلنا لهم: وزعموا أن الله لم يتكلم، فبأيِّ شيءٍ خلق الله الخلق؟

أموجودٌ عن الله أنه خلق الخلق بقوله وبكلامه حين قال: ﴿إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَىْءٍ إِذَآ أَرَدْنَٰهُ أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾ [النحل - ٤٠].

قالوا: إنما معنى قوله: ﴿إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَىْءٍ إِذَآ أَرَدْنَٰهُ﴾ يكون.

قلنا لهم: فلِمَ أخفيتم: ﴿أَن نَّقُولَ لَهُۥ﴾؟!

فقالوا: إنما معنى (كل شيء) في القرآن معانيه، (وقال الله)، مثل قول العرب: (قال الحائط)، و(قالت النخلة فسقطت)، والحائط والنخلة لا يقولان شيئًا.

فقلنا: على هذا قِستم؟!

قالوا: نعم.

فقلنا: فبأيِّ شيء خلق الله الخلق إن كان الله في مذهبكم لم يتكلم؟

فقالوا: بقُدرته.

فقلنا: قُدرتُه هي شيء؟

فقالوا: نعم.

فقلنا: قُدرتُه مع الأشياء المخلوق؟

قالوا : نعم.

فقلنا : كأنه خلق خلقًا بخلقٍ، وعارضتم القرآن وخالفتموه حين قال الله جلَّ ثناؤه: ﴿ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَىۡءٍ﴾ [الزمر - ٦٢]، فأخبرنا الله أنه يخلق.

وقال : ﴿هَلۡ مِنۡ خَٰلِقٍ غَيۡرُ ٱللَّهِ﴾ [فاطر - ٣] .

فإنه ليس أحدٌ يخلق غيره تبارك وتعالى.

وزعمتم أنه خلق الخلق غيرُه.

فتعالى الله عما قالت الجهمية علوًّا كبيرًا

**٤٤** - وە پێمان وتن : پێیان وایە اللە قسەی نەکردووە، ئەی بە چ شتێک اللە مەخلوقەکانی دروست کردووە؟

ئایا ئەوە بوونی هەیە دەربارەی اللە کە مەخلوقەکانی دروست کردووە بە قەول و کەلامی خۆی کاتێ دەفەرموویت : ﴿إِنَّمَا قَوۡلُنَا لِشَىۡءٍ إِذَآ أَرَدۡنَٰهُ أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾ [النحل - ٤٠] .

وتیان : مانای ئەم فەرمایشتەی اللە : ﴿إِنَّمَا قَوۡلُنَا لِشَىۡءٍ إِذَآ أَرَدۡنَٰهُ﴾ واتە دەبێت .

پێمان وتن : ئەی بۆچی ئەمەتان شاردەوە : ﴿أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾؟

وتيان : (كل شيء) و (و قال الله) له قورئاندا چەند مانايەكى هەيە، وەك وتەى عەرەبە كە دەڵێن : (ديوارەكە وتى)، و (خورماكە وتى، پاشان كەوت)، ديوار و خورماش هيچ شتێك ناڵێن .

وتمان : ئايا لەسەر ئەوە قياستان كردووە؟!

وتيان : بەڵێ .

وتمان : كەواتە الله بە چ شتێك دروستكراوەكانى درووست كردووە ئەگەر وەكو ئەوەبێ كە لە مەزهەبەكەى ئێوە دا هەيە الله قسەى نەكردووە؟

وتيان : بە قودرەتەكەى .

ئێمەش وتمان : ئايە قودرەتى الله شتە؟

وتيان : بەڵێ .

ئێمەش وتمان : قودرەتى الله لەگەڵ شتە مەخلوقەكانە؟

وتيان : بەڵێ .

ئێمەش وتمان : وەكو بڵێى كە مەخلوقێك بە مەخلوقێكى درووست كردبێت، وە ڕەخنەتان لە قورئان گرت و پێچەوانەى قورئانتان كرد كاتێ

الله جلَّ ثناؤه دەفەرموێت : ﴿ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَىۡءٍ﴾ [الزمر - ٦٢]، جا الله بە ئێمەی ڕاگەیاندووە کەوا خەلق دەکات .

وە فەرموویەتی : ﴿هَلۡ مِنۡ خَٰلِقٍ غَيۡرُ ٱللَّهِ﴾ [فاطر - ٣] .

جا هیچ کەسێکی تر نییە کە خەلق بکات غەیری الله تبارک وتعالی .

وە پێتان وابوو کەوا بێجگە لە الله تعالی مەخلوقەکان درووست دەکات .

بۆیە بەرزی و بڵندی و گەورەیی بۆ الله لەوەی کە جەهمیەکان دەیڵێن .



# باب (١٦)

## ما ادعت الجهمية أن القرآن مخلوق من الأحاديث التي رويت



٤٥ - فقالوا : جاء الحديث : (إن القرآن يجيء في صورة الشابِّ الشاحب، فيأتي صاحبه فيقول: هل تعرفني؟

فيقول له : من أنت؟

فيقول : أنا القرآن الذي أظمأت نهارك وأسهرت ليلك.

قال : فيأتي به الله فيقول : يا رب ..) .

فادَّعوا أن القرآن مخلوق من قِبَلِ هذه الأحاديث.

فقلنا لهم : القرآن لا يجيء، بمعنى: أنه قد جاء من قرأ : ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ [الإخلاص - ١]، فله أجر كذا وكذا.

ألا ترون أن من قرأ : ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾، لا يجئه إلَّا بثوابه؛ لأنا نقرأُ القرآن ويجيء ثواب القرآن فيقول : يا رب . . لأن كلام اللهِ لا يجيء ولا يتغيَّر من حال إلى حال.

وإنما معنى : (أن القرآن يجيءُ) : إنما يجيء ثواب القرآن، فيقول : يا رب .

# باب (١٦)

## ئەوەی جەهمیەکان بانگەشەیان کرد لەوەی قورئان مەخلوقە لە فەرموودە ڕیوایەت کراوەکان هاتووە



**٤٥** - وتیان : فەرموودە هاتووە کە دەفەرموویت : (قورئان دێت لەسەر شێوەی گەنجێکی کە ڕەنگ و شێوە و جەستەی دەگۆڕێ - بۆیە بەم شێوەیە چونکە لە دونیادا کەسی قورئان خوێن لە دونیادا ماندوو دەبێ جا لە قیامەتیش تەعبیر لەوە دەکات - , دێتە لای ئەو کەسەی کە خوێندوویەتیەوە دەڵێت : دەمناسیتەوە؟

پێی دەڵێت : تۆ کێیت؟

دەڵێت : من قورئانم ئەوەی کە لە ڕۆژدا تینووم دەکردی وە لە شەودا بە ئاگا دەمهێشتیتەوە .

وتی : ئینجا دەیهێنیتە لای الله تعالى و دەڵێت : یا رب - واتە بەمەبەستی کردنی شەفاعەت دێتە لای الله تعالى - ) .

جا - جەهمیەکان - بانگەشەی ئەوەیان کرد کە قورئان مەخلوقە لە ڕووی ئەو فەرموودانەوە .

ئێمەش پێمان وتن : قورئان نایەت بەو مانایەی کە : ئەو بەوشێوەیە هاتووە کە ئەوەی ئەمە بخوێنێتەوە : ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ [الإخلاص - ١]، ئەوا پاداشتی ئەوە و ئەوەی هەیە .

ئایا نابینی کە هەرکەسێ : ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ بخوێنێتەوە، ئەوا قورئانەکە نایەت ئیللا پاداشتەکەی نەبێ، لەبەرئەوەی ئێمە قورئان دەخوێنینەوە و پاداشتی قورئانەکە دێت و دەڵێت : یارب .

چونکە کەلامی الله نایەت، وە لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکیتر ناگۆڕێت .

وە مانای ئەوەی کە : (قورئان دێت) : ئەوەیە پاداشتی قورئانەکە دێت و دەڵێت : یا رب .



# باب (١٧)

## ما تاولت الجهمية من قول الله تعالى ﴿هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡـَٔاخِرُ﴾ [الحديد - ٣]



**٤٦** - فزعموا أن الله هو الأول قبل الخلق، فصدقوا.

وقالوا: يكون الآخر بعد الخلق، فلا تبقى سماء، ولا أرضٌ، ولا جنة، ولا نار، ولا ثواب، ولا عِقاب، ولا عرش، ولا كُرسي.

وزعموا أن شيئاً مع الله لا يكون هو الآخر كما كان.

فأضلوا بهذا بشراً كثيراً.

فقلنا: أخبرنا الله عن الجنة ودوام أهلها فيها، فقال سبحانه وتعالى: ﴿لَّهُمۡ فِيهَا نَعِيمٌ مُّقِيمٌ﴾ [التوبة - ٢١].

وقال: ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ﴾ [النساء - ٥٧].

وقال: ﴿أُكُلُهَا دَآئِمٞ﴾ [الرعد - ٣٥].

فإذا قال الله : ﴿دَآئِمٌ﴾، أي : لا ينقطع أبداً.

وقال : ﴿وَمَا هُم مِّنۡهَا بِمُخۡرَجِينَ﴾ [الحجر - ٤٨] .

وقال : ﴿وَإِنَّ ٱلۡأٓخِرَةَ هِيَ دَارُ ٱلۡقَرَارِ﴾ [غافر - ٣٩] .

وقال : ﴿وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ لَهِيَ ٱلۡحَيَوَانُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ﴾ [العنكبوت - ٦٤]

.

وقال : ﴿مَّٰكِثِينَ فِيهِ أَبَدٗا﴾ [الكهف - ٣] .

وقال : ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبۡيَضَّتۡ وُجُوهُهُمۡ فَفِي رَحۡمَةِ ٱللَّهِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ [آل عمران : ١٠٧] .

وقال : ﴿وَفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ (٣٢) لَّا مَقۡطُوعَةٖ وَلَا مَمۡنُوعَةٖ (٣٣)﴾ [الواقعة] .

ومثله في القرآن كثير .

ثم ذكر أهل النار، فقال : ﴿لَا يُقۡضَىٰ عَلَيۡهِمۡ فَيَمُوتُواْ وَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُم مِّنۡ عَذَابِهَاۚ﴾ [فاطر - ٣٦] .

وقال : ﴿أُوْلَٰٓئِكَ يَئِسُواْ مِن رَّحۡمَتِي﴾ [العنكبوت - ٢٣] .

وقال : ﴿لَا يَنَالُهُمُ ٱللَّهُ بِرَحۡمَةٍۚ﴾ [الأعراف - ٤٩] .

وقال : ﴿وَنَادَوۡاْ يَٰمَٰلِكُ لِيَقۡضِ عَلَيۡنَا رَبُّكَۖ قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ﴾ [الزخرف - ٧٧] .

وقال : ﴿سَوَآءٌ عَلَيۡنَآ أَجَزِعۡنَآ أَمۡ صَبَرۡنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ﴾ [إبراهيم - ٢١] .

وقال : ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ شَرُّ ٱلۡبَرِيَّةِ﴾ [البيّنة - ٦] .

وقال : ﴿كُلَّمَا نَضِجَتۡ جُلُودُهُم بَدَّلۡنَٰهُمۡ جُلُودًا غَيۡرَهَا﴾ [النساء - ٥٦]

وقال : ﴿كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا مِنۡ غَمٍّ أُعِيدُواْ فِيهَا﴾ [الحج - ٢٢] .

وقال : ﴿إِنَّهَا عَلَيۡهِم مُّؤۡصَدَةٌ﴾ [الهمزة - ٨] .

ومثلُه في القرآن كثير.

فأما السماء والأرض فقد زالتا، لأن أهلها صاروا إلي الجنة، أو إلى والنار.

وأما العرش فلا يبيدُ، ولا يذهب؛ لأنه سقفُ الجنة، والله سبحانه وتعالى عليه فلا يهلَكُ ولا يبيد.

وأما قوله عَزَّ وَجَلّ : ﴿كُلُّ شَيۡءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجۡهَهُۥ﴾ [القصص - ٨٨]، وذلك أن الله أنزل : ﴿كُلُّ مَنۡ عَلَيۡهَا فَانٍ﴾ [الرحمن - ٢٦] .

قالت الملائكة : هلك أهل الأرض، فطمِعوا في البقاء، فأنزل الله مخبرًا عن أهل السمٰوات وأهل الأرض أنهم يموتون، فقال: ﴿كُلُّ شَيْءٍ﴾؛ يعني : من الحيوان، ﴿هَالِكٌ﴾؛ يعني : ميت، ﴿إِلَّا وَجۡهَهُۥ﴾، أنه حيٌّ لا يموت، فأيقنوا عند ذلك بالموت .

# باب (١٧)

## ئەوەی جەهمیەکان تەئویلیان کرد لە فەرمایشتی الله کە دەفەرمووێت : ﴿هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡآخِرُ﴾ [الحدید - ٣]



٤٦ - جەهمیەکان - پێیان وابوو کە الله یەکەم بووە پێش دروستکراوەکانی - یەکێک لە ناوەکانی الله (الأول)ە - ، ڕاستیشیان کرد .

وە وتیان : الله دەبێتە کۆتا لە دوای دروستکراوەکان، جا نە ئاسمان، و نە زەوی، و نە بەهەشت، و نە دۆزەخ، و نە پاداشت، و نە سزا، و نە عەرش، و نە کورسی نامێنێتەوە .

وە پێیان وابوو کە هەر شتێک لەگەڵ الله دا نەمابێت ئەوا کۆتایە .

بە هۆی ئەمەشەوە خەڵکانێکی زۆریان گومڕا کرد .

بۆیە ئێمەش وتمان : الله تعالی پێی ڕاگەیاندووین دەربارەی بەهەشت و بەردەوامی ئەهلەکەی تێیدا، هەروەکو فەرموویەتی : ﴿لَّهُمۡ فِيهَا نَعِيمٞ مُّقِيمٌ﴾ [التوبة - ٢١] .

وە دەفەرموویت : ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۖ﴾ [النساء - ٥٧] .

وە دەفەرموویت : ﴿أُكُلُهَا دَآئِمٌ﴾ [الرعد - ٣٥] .

کاتێ الله دەفەرموویت : ﴿دَآئِمٌ﴾، واتە : هەمیشەیە و هەرگیز ناپچڕێت .

وە دەفەرموویت : ﴿وَمَا هُم مِّنۡهَا بِمُخۡرَجِينَ﴾ [الحجر - ٤٨] .

وە دەفەرموویت : ﴿وَإِنَّ ٱلۡأٓخِرَةَ هِيَ دَارُ ٱلۡقَرَارِ﴾ [غافر - ٣٩] .

وە دەفەرموویت : ﴿وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ لَهِيَ ٱلۡحَيَوَانُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ﴾ [العنكبوت - ٦٤] .

وە دەفەرموویت : ﴿مَّٰكِثِينَ فِيهِ أَبَدًا﴾ [الكهف - ٣] .

وە دەفەرموویت : ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبۡيَضَّتۡ وُجُوهُهُمۡ فَفِي رَحۡمَةِ ٱللَّهِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ [آل عمران - ١٠٧] .

وە دەفەرموویت : ﴿وَفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ (٣٢) لَّا مَقۡطُوعَةٖ وَلَا مَمۡنُوعَةٖ (٣٣)﴾ [الواقعة] .

وە نموونەی وەک ئەم ئایەتانە زۆرن لە قورئاندا .

پاشان باسی ئەهلی ئاگری کردووە، دەفەرموویت : ﴿لَا يُقۡضَىٰ عَلَيۡهِمۡ فَيَمُوتُواْ وَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُم مِّنۡ عَذَابِهَاۚ﴾ [فاطر - ٣٦] .

وه‌ ده‌فه‌رموویّت : ﴿أُوْلَٰٓئِكَ يَئِسُواْ مِن رَّحۡمَتِي﴾ [العنكبوت - ٢٣] .

وه‌ ده‌فه‌رموویّت : ﴿لَا يَنَالُهُمُ ٱللَّهُ بِرَحۡمَةٍۚ﴾ [الأعراف - ٤٩] .

وه‌ ده‌فه‌رموویّت : ﴿وَنَادَوۡاْ يَٰمَٰلِكُ لِيَقۡضِ عَلَيۡنَا رَبُّكَۖ قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ﴾ [الزخرف - ٧٧] .

وه‌ ده‌فه‌رموویّت : ﴿سَوَآءٌ عَلَيۡنَآ أَجَزِعۡنَآ أَمۡ صَبَرۡنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ﴾ [إبراهيم - ٢١] .

وه‌ ده‌فه‌رموویّت : ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ شَرُّ ٱلۡبَرِيَّةِ﴾ [البينة - ٦] .

وه‌ ده‌فه‌رموویّت : ﴿كُلَّمَا نَضِجَتۡ جُلُودُهُم بَدَّلۡنَٰهُمۡ جُلُودًا غَيۡرَهَا﴾ [النساء - ٥٦] .

وه‌ ده‌فه‌رموویّت : ﴿كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا مِنۡ غَمٍّ أُعِيدُواْ فِيهَا﴾ [الحج - ٢٢] .

وه‌ ده‌فه‌رموویّت : ﴿إِنَّهَا عَلَيۡهِم مُّؤۡصَدَةٌ﴾ [الهمزة - ٨] .

وه‌ نموونه‌ی وه‌ک ئه‌م ئایه‌تانه‌ زۆرن له‌ قورئاندا .

ئه‌مما ئاسمان و زه‌وی هه‌ردووکیان نامێنن چونکه‌ ئه‌هله‌که‌ی یان ده‌چن به‌ره‌و به‌هه‌شت، یان به‌ره‌و دۆزه‌خ .

وه عەرش لەناو ناچێت، و ناڕوات، لەبەرئەوەی سەقفی بەهەشتە، وە الله سبحانه وتعالى لەسەریەتی لەناو ناچێت و تێکناچێت.

وە هەروەها فەرمایشتی الله تعالى کە فەرموویەتی: ﴿كُلُّ شَيۡءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجۡهَهُۥ﴾ [القصص - ٨٨].

وە بەهەمان شێوە الله دایبەزاندووە کە دەفەرمووێت: ﴿كُلُّ مَنۡ عَلَيۡهَا فَانٍ﴾ [الرحمن - ٢٦].

فریشتەکان وتیان: ئەهلی زەوی هەموویان لەناو چوون، جا تەماعی مانەوەی هەمیشەییان هەبوو، الله تعالى هەواڵی دابەزاند دەربارەی ئەهلی ئاسمانەکان و ئەهلی زەوی کە دەمرن، فەرمووی: ﴿كُلُّ شَيۡءٍ﴾، واتە: لە زیندەوەران، ﴿هَالِكٌ﴾، واتە: دەمرن، ﴿إِلَّا وَجۡهَهُۥ﴾، ئیللا الله نەبێت کە ئەو زیندووە و نامرێت، ئا لەو کاتەدا دڵنیا دەبن کە دەمرن.



**٤٧** - وقلنا للجهمية حين زعموا أن الله في كل مكان لا يخلو منه مكان دون مكان، فقلنا لهم: أخبرونا عن قول الله جلَّ ثناؤه: ﴿فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ﴾ [الأعراف - ١٤٣]، لِمَ تجلَّى للجبل إن كان فيه بزعمهم؟!

فلو كان فيه - كما تزعمون - لم يكن يتجلَّى لشيء هو فيه؛ ولكن الله جلَّ ثناؤه على العرش، وتجلَّى لشيء لم يكن فيه، ورأى الجبلُ شيئًا لم يكن رآه قطُّ قبل ذلك.

**٤٧** - وە ئێمە بە جەهمیەکانمان وت کاتێ پێیان وابوو کە اللە لە هەموو شوێنێکە، وە هیچ شوێنێک خاڵی نییە لە اللە، پێمان وتن: پێمان بڵێن دەربارەی فەرمایشتی اللە جلَّ ثناؤە کە دەفەرمووێت: ﴿فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ﴾ [الأعراف - ١٤٣]، بۆچی خۆی نیشانی شاخەکەدا ئەگەر خۆی لەوێ بووبێت بە پێی بیر و بۆچوونی ئێوە؟ - واتە جەهمیەکان کە دەڵێن اللە لەهەموو شوێنێکە، کەوایە بۆچی خۆی نیشانی شاخەکەدا ئەگەر پێشتریش لەوێ بووبێت -.

ئەگەر ئەو لەوێ بێت هەروەکو ئێوە پێتان وایە، ئەوا خۆی نیشانی شتێک نەدەدا کە خۆی تێیدا بووبێت، بەڵکو اللە جلَّ ثناؤە لەسەر عەرشە، وە خۆی نیشانی شتێک داوە کە لەوێدا نەبووە، وە شاخەکە شتێکی بینی کە پێشتر هەرگیز نەیدیبوو.



**٤٨** - وقلنا للجهمية : الله نور؟

فقالوا : هو نور كله.

فقلنا : فالله قال : ﴿وَأَشۡرَقَتِ ٱلۡأَرۡضُ بِنُورِ رَبِّهَا﴾ [الزمر - ٦٩] .

فقد أخبر الله جلَّ ثناؤه أن له نورًا .

وقلنا لهم : أخبرونا حين زعمتم أن الله تعالى في كل مكان، وهو نور، فلِمَ لا يُضيء البيتُ المظلم من النور الذي هو فيه إذ زعمتم أن الله في كل مكان؟

وما بال السَّراج إن أدخل البيت المظلم يُضيء؟!

فعند ذلك تبيَّن للناس كذِبهم على الله تعالى.

فرَحِمَ الله من عقل عن الله، ورجع عن القول الذي يُخالف الكتاب والسُّنَّة، وقال بقول العلماء، وهو قول المهاجرين والأنصار، وترك دين الشيطان، ودين جهم وشيعته .

**٤٨** - وه به جههميهكانمان وت : الله ڕووناكيه؟

وتيان : ئهو ههموو ڕووناكيهكه .

ئێمەش وتمان : الله تعالى دەفەرمووێت : ﴿وَأَشۡرَقَتِ ٱلۡأَرۡضُ بِنُورِ رَبِّهَا﴾ [الزمر - ٦٩] .

ئەوەتا الله تعالى هەواڵی پێداوین کە ڕووناکی هەیە .

بە جەهمیەکانمان وت : کاتێ ئێوە پێتان وایە الله تعالى لە هەموو شوێنێکە و الله ڕووناکیە، پێمان بڵێن بۆچی ماڵێکی تاریک ڕووناک نابێتەوە بەو ڕووناکیەی کە الله هەیەتی مادام پێتان وایە الله لە هەموو شوێنێکە؟

ئەی بۆچی کە خۆر لەماڵێکی تاریک دەدات و ڕووناکی دەکاتەوە؟

جا لەوێدا درۆکانیان ڕوون بویەوە لای خەڵک کە دەربارەی الله کردبوویان .

ڕەحمەتی الله لەوەی کە لە الله تێدەگات، وە پاشگەز دەبێتەوە لەو قسەیەی کە پێچەوانەی قورئان و سوننەتە، وە قسە دەکات بە قسەی زانایان، کە ئەویش قسەی مهاجرین و الانصار ە، وە واز دەهێنێ لە دینی شەیتان، و دینی جەهم و شوێنکەوتوو و لایەنگرەکانی .



